پرۆژەی (٥٠) کتێب بۆ
ناساندنی گەورە پیاوانی کوردی مسوڵمان
کتێبی چوارەم

سەروەت عەبدوڵڵا

# خەرمانێك لە وتە زێڕینەكانی
# كاك ئەحمەدی موفتی زادە





چاپی دووەم

# خەرمانێك لە وتە زێڕینەكانی
# كاك ئەحمەدی موفتی زادە

# بسم الله الرحمن الرحيم

تەنها بەناوی خوای گەورەو کاربەجێ

بۆ پرەودان وخزمەتکردنی زیاتر بە ڕەوتی ڕۆشنبیری و هەستکردن بەو بۆشاییەی کە لە کتێبخانەی کوردیدا لە بواری ناساندنی گەورە پیاوان و بیریارانی موسوڵمانی کوردەوە هەیە، بڕیارمان لە پرۆژەیەکی لەو جۆرە کردەوەو بڕیارماندا ئەگەر تەنها هەوڵێکیش بوو لەو بوارەدا پرۆژەی (٥٠) کتێب لەسەر گەورە پیاوانی کورد و ئیسلام و خاوەن مەزهەب و هزر و بیریار و سیاسەتمەدار و خاوەن قوربانی و هەڵوێستی بەرز و ناوازە کارێک بکەین، هەر بۆیە پرۆژەکەشمان ناونا «پرۆژەی ناساندنی گەورە پیاوانی کوردی موسوڵمان»، لێرەشەوە ڕادەگەیەنین هەر بەڕێزێک دەتوانێ نووسینەکەی (بەرهەم)ەکەی بنێرێت بۆمان، ئەوا بەپێی ڕێکەوتنێک لە نێوانماندا لێی وەردەگرین و پاشان بە پەسەندکردنی دەخرێتە پرۆژەکەوە.

ئەو گەورە پیاوانەشی کە لەبەرچاومان گرتوون لە دەستپێکی کارماندا «کاک ئەحمەدی موفتیزادە – کاک ناصری سوبحانی – مامۆستا سەعیدی نورسی – مەلای گەورە – مامۆستا شێخ محمدی خاڵ – ئەحمەد زەهاوی – مامۆستا محمدی شارەزووری .... هتد»، وە هەر زانایەکی دیکە کە لەو بوارانەدا بەڕێزیان دیارە وخزمەتیان کردووە.. خوای گەورە گشتلایەک موەفەق بکات ...

پرۆژەی (ناساندنی گەورە پیاوانی کوردی موسوڵمان)

خاوەنی پرۆژە

سەروشت عەبدوڵڵا

کاوە شێخ بونیا

# خەرمانێك لە وتە زێڕینەكانی
# كاك ئەحمەدی موفتی زادە

سەروەت عەبدوڵڵا

سلێمانی

٢٠١٤

خەرمانێك لە وتە زێڕینەكانی كاك ئەحمەدی موفتی زادە

- ئامادەكردنی: سەروەت عەبدوڵڵا
- بابەت: پەروەردەیی، فیكری
- پیتچنی: ئیمان وشیار، بەهرە مەهدی
- هەڵەچنی: نووسەر
- نەخشەسازیی بەرگ: سەروەت گوڵئەسەر
- نۆرەی چاپ: دووەم
- تیراژ : (١٠٠٠) دانە
- چاپخانە: سیما
- لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانە گشتییەكان ژمارە(١٧٢٦)ی ساڵی (٢٠١٢)ی پێدراوە.

ئەم بەهەمەم پێشکەش دەکەم بە:

**کوردانی هەر چوار پارچەکەی کوردستان**

# پێشەکی

## خوێنەری خۆشەویست!

ئەم بەرهەمەی لەبەردەستتدایە بریتییە لە هەوڵێکی لەخۆبووردانەی بەندەیە بەرەو ئاراستەی هەرچی زیاتر ناساندنی زانای پایەبەرز و بیریاری ئیسلامی کوردستانی رۆژهەڵات (کاك ئەحمەدی موفتی زادە)، یەکێکی دیکەیە لەوکارانەی کە ئامانجی بریتییەلە ئامادەکردنەوەی دووبارەی ئەم بیریارە کەنارخراوە لە مەیدانی تێکۆشان و، دووبارە گەڕاندنەوەیەتی بۆ ناو مەجلیس و دانیشتنە فکری و فەلسەفە و پەروەردەییەکان، ئەو مەجلیسانەی رۆژێك لە رۆژان خۆی بە تەواوی ئیخلاس و ئامادەگییەوە سەرۆکاری دەکردن و بەڕێوەی دەبرن و گفتوگۆو دانیشتنەکانی ئاراستە پێدەدا! هەوڵێکی دیکەیە بەمەستی ئاشناکردنی نەوەی ئێستا و داهاتووی کورد و دونیا بە زانایەکی ماندوی مەیدانی (ئاین، بیر، پەروەردە، سیاسەت و، نەتەوایەتی)، بیرخستنەوەیەکە بۆ نەوەی رابردوو، نەوەی سەردەمی بوونی خۆی، کە هەندێکیان بە ئەنقەست و هەندێکیان بە نەزانی و، برێکیشیان بە نەشارەزای و بێخەمی ئەم بیرمەندەیان خستۆتە کەنارەوە و هەوڵیانداوە گومناوی بکەن و لە لاپەڕەکانی مێژوودا ئەگەر نەشتوانن ناوی بسڕنەوە ئەوا بەکورتی و لە چەند دێڕێکدا باسی بکەن، یاخود گومان لە بوون و هەوڵەکانی بکەن! کە یەکێك لەو بابەتانەی جێگەی سەر سوڕمانە لە خەباتی ئەو پیاوەدا ئەوە بووە، کە کوردەکانی رۆژهەڵات و ئەوانەی خاوەنی حیزب و گروپێکی دیاریکراون گومانیان لێی هەبووە و بە کرێگیراوی ئێران و دەستەڵاتیان زانییوە بە ئێستاشەوە، لەولاشەوە ئێران کە دوژمنی ئەو تاقمەی یەکەم گومانی لەم پیاوە هەبووە و بە هەمان شێوە بە کرێگیراو وەصفیانرکدووە و سەرگوزشتەشی دیارە لەو ولاتەدا چی لێکرا! جا کاتێك ئەم دژ

یەکییە دەبینیت ئیتر دڵنیا دەبیت، کەسی سێیەم کە (کاک ئەحمەد)ە، پیاوێکی باك و بۆ خوا سوڵحا و نەتەوە و نیشتمان دۆست بووە.

ئەوانەی بەرهەمەکانی پێشوتریان خوێندبێتەوە لەوە دڵنیا بوون، ئەم هەوڵانەی بەندە جگە لەوەی دەیەوێت ئەم خەباتگێڕەبگەڕێنێتەوە مەیدانی خەباتی خۆ و بە دۆست و دوژمن بڵێت: (کاک ئەحمەد) بیرمەند و زانایەکی گەورەیە، جەنگاوەر و چاونەترسێکی کەم وێنەیە، پێویستە لەسەرتان مێژووی هەوڵو ماندوبوون و، فکر و ئامانجی بزانن، لە مەبەست و کار و کرداری وانە فێربن، دەبێت لە دڵسۆزی و خۆشەویستی بۆ نیشتمان ڕێزبنووێن، لەپایی خەم و ئازارەکانیدا سەردانەوێنن... شتێك دیکەم نەکردووە.

ئەم بەرهەمە بریتییە لە ئامادەکرنی بەشێك لەو وتە ناوازە و پڕمانا و دانسقە و بە پەندانەی، کە لە میانەی ئەو وتار و نووسین و نامە و دەفتەرە شیعریانەی لە دوای وەفاتی خۆی بەجێی هێشتووە. ئێمە دوای گەران و خوێندنەوە و گوێگرتن لە بەشێك لە وتارەکانی بڕیارماندا کارێکی بەم جۆرە ئامادە بکەین، تا هەرچی زیاتر خەڵکی لە ژیان و بەرهەمی ئەم مەردە نەبەردە شارەزابن، ئەگەر کەسێك تا ئێستا نەیتوانییەوە دەستی بگات بەو (سێ) بەهەمەی پێشوو و ئەم زانایە باش ناناسێت، ئەوا دەتوانێت لە ڕێگەم ئەم بەرهەمەوە بە فکر و کرداری شارەزابێت.یەکێك لە هۆکارەکانی دیکەی ئەم کارەمان پەیوەندی بە ماندوو بوونی خوێنەرەوە هەیە لەدەست دەقی دوورودرێژ و ماندوکە، ئێمە ویستمان هاوکارییەکی خوێنەر بکەین و ڕێگەی دوری تێگەیشتن و پێگەیشتن بەم زانا و بیرمەندە کورت بکەینەوە بۆ چوار چێوەی تێکستگەلێك، کە بتوانێت لەماوەیەکی کورتدا زۆرترین زانیاری وەربگرێت، جا هەر لێرەدا چەند ڕوونکردنەوەیەك بەگرنگ دەزانین:

سەرەتا خوێنەر دەبێت لەوە دڵنیا بێت وتەکانی ناو ئەم بەرهەمەوە زۆربەی زۆرییان (مەتن)ن! واتە پێویستیان بە شەرح هەیە، بۆیە ئەگەر وتەیەك ڕوون نەبوو بەلایەوە دەکرێت لەکەسێکی دیکەی شارەزای بواری فیکری ئەم زانایە پرسیاربکات و داوای شەرح بکات یان بگەڕێتەوە بۆ ئەو سەرچاوانەی ئاماژەیان بۆ کراوە، هەروەها چەند وتەیەك هەیە لەراستیدا لە چاو زۆربەی وتەکانی دیکەدا درێژترن، ئەمەش تەنها لەبەرگرنگی باسەکە و ئاسان تێگەیشتنی خوێنەرانە، بۆیە بەناچاری لەکاتی گواستنەوەی وتەکاندا نەمانوویست ناروونی بە وتەکە ببەخشین، بەڵکو وەك خۆی بە درێژی دامان نایەوە. جگەلەوەش خوێنەر لەکاتی خوێندنەوەی بەرهەمەکەدا چاوی بە چەند (شیعر)ێك دەکەوێت، کە لە دیوانی (دیاریێ بۆ یاران)ەوە وەرمانگر تووە، ئەمەش لەبەر بەهێز و پڕپەندنی ناوەڕۆکی تێکستە شیعرییەکانە، کە جارێکی دیکە خوێنەران دەتوانن لە قوڵای خەم و فکری (کاك ئەحمەد) تێبگەن...

بەگشتی بەرهەمەکە بەسەر سێ بەشی سەرەکی و چەند تەوەیەکدا دابەش دەبێت: بەشی یەکەم تایبەتە بە (هەندێك)* لە وتەکانی(کاك ئەحمەد)ە، دەربارەی (پەروەردە)کرد، کەتێیدا بەشێوەیەکی جدی پێداگری لەسەر گرنگی پەروەردە دەکاتەوە، بۆ تاك و، دروستکردنی کۆمەڵگەیەکی تەندروست، ئەمەش شتێکی ئاشکرایە و لەبەرهەمەکانی پێشوترماندا باسی گرنگی و ڕۆڵی پەروەردەمانکردووە لە دونیای فکر و مەکتەبی (کاك ئەحمەد)دا. هەرچی بەشی دووەمە: ئەوا وتەگەلێکی

---

*) لەراستیدا بۆیە دەڵێین : (هەندێك)، چونکە بەدڵنیاییەوە کاك ئەحمەد لە هەموو ئەو بوارانە و جگە لەمانەش وتەی زۆر ناوازەم و پڕبایەخ و بەسودی هەیە، کە بەداخەوە دەستی بەندە پێیان نەگەیشتووە و نەمتوانییەوە بیانهێنم و لێرەدا پێکەشیان بکەم، بۆیە ئەم بەرهەمەوو هەموو ئەو وتانەی لێرەدا بلاَوکراونەتەوە بەشێکن لە وتەکانی کاك ئەحمەد، خوا هاوکارمان بێت بتوانین بە هەوڵ و هاوکاری دۆستان لە ئایندەدا و لە چوارچێوەی بەرگێکی دیکەدا ئەوانەی کە هەن و ئێمە نەمانبینیون ئامادەیان بکەین و بلاَویان بکەینەوە.

ناوازەیە دەربارەی بابەتەکانی (ئاین و فکر)، کە تێیدا توانراوە زۆر بە ئاشکرا (جیهانی بوونی بیری کاك ئەحمەد)* و قوڵی دەرك و فەهمی ئەم زانایە بخرێتە ڕوو، کە لەم دەروازەیەوە خوێنەر زۆر بەئاسانی دەتوانێت کەشفی ئامانجی بزوتنەوە مەکتەبییەکەی (کاك ئەحمەد) بکات و لە ڕۆشنای وتەکانی خۆیەوە ڕاستەوخۆ بە وەڵامی پرسیارگەلێکی جەوهەری و هەڵەپسێراو بگات.

بەشی سێهەمیش: هەندێك لە وتە پڕ پەند و واتادارەکانە دەربارەی (سیاسەت و نەتەوە و دەوڵەتداری)، کە تێدا لە شێوەی (مەتن)**دا چەندین بۆچوونی خۆی دەربارەی ئەم پرسانە ئاشکرا، بە دەبڕینی جوان و دانسقەکانی چەندین ئامۆژگاری و خەم و هەوڵی بێوچانی بۆ بەدەستهێنانی مافی (نەتەوەی و ئاین و سیاسی) کورد و کوردستان دەخاتەڕوو...

لە کۆتای بەرهەمەکەشدا هەموو ئەو سەرچاوانە خراونەتەڕوو، کە بۆ ئامادەکردنی ئەم بەهەمە سودیان لێوەرگیراوە، بە ئومێدی ئەوەی خوێنەر لە هەر شوێنێکدا پێویستی پێیبوو، یان ویستی زیاتر شارەزا بێت، بگەڕێتەوە بۆیان و سودیان لێوەرگرێت.

ئەوەی ماوەتەوە بیڵێم سوپاسکردنی دوو هاوڕێی بەڕێز و خۆشەویستمن، کە لە ئامادەکرنی ئەم بەرهەمەدا هاوکارییانکردم، ئەگەر ئەوان نەبوونایە پێویستم

---

* ) جیهانی بوونی بیری کاك ئەحمەدی موفتی زادە: ئەمە پشتیوان بە خوای گەورە ناونیشانی باسێکی تایبەتی دەبێت دەربارەی: بیر و هەوڵ و ئامانجەکانی کاك ئەحمەد، کە لە ئایندەدا دەنووسرێت و بڵاودەکرێتەوە...

** بۆیە دەڵێین (مەتن): چونکە بڕوامان وایە بەشێکی زۆری وتەکانی ئەم بەشە پێویستیان بە شەرحی چەند سەعاتی و دەیان لاپەڕە نووسین هەیە، هەرلەبەرئەمە بۆ خوێنەر گرنگە کەمێك زیاتر و وردتر تەرکیز بکات....

بەکاتێکی زۆر زیاتر دەبوو تاوەکو بمتوانیایە ئامادەی بکەم، ئەوانیش: بەڕێز خاتو (ئیمان وشیار)، کە بەڕاستی ماندونەناسانە هاوکاری پیتچنی بەشێك لەم بەرهەمەی گرتە ئەستۆی خۆی و لەپاڵ هەوڵەکانی بۆ تەواوکردنی خوێندنی زانکۆیی، توانی هاوکاری بەندەش بکات! هاوڕێکەی دیکەشم: (بەهرە گوڵئەسەری) خێزانمە، کە ئامادەکردنی ئەم بەرهەمە بەشێکی زۆری لە چوارچێوەی کاتەکانی تایبەت بە ئەودا بووە، ئەمە جگە لەوەی بەشێك لە پیتچنی بەرهەمەکەی گرتە ئەستۆ و جارێکی دیکە ساتەکانی حەوانەی بەخشییە ئەم بەرهەمە بۆئەوەی هەرچی زووترە بگاتە دەستی تۆی خوێنەر و تۆش لە دونیا فراوانەکەی (کاك ئەحمەدی موفتی زادە) سود وەرگریت...

ئێمە لە پەروەردگار داواکار بووین، کە نەییەتی ئیخلاسمان باڵی نوورانی خۆی بکێشێت بەسەر ئەم هەوڵومانـدو بوون و شەونخونییەماندا، بە ئومێدی ئەوەی جێگەی خۆی بگرێت، (چونکە هیچ کارێك نییە بەبێئیخلاس بتوانێت جێکەوتەی هەبێت، تەنانەت ئەوانەش کە نییەتی خراپیان هەیە ئەگەر بە ئیخلاسی کار بۆ ئەو نییەتە خراپە بکەن هەر جێکەوتەی دەبێت!)* لە ئێوەش داوادەکەین، هەرکاتێك دڵت ئامادەیی هەبوو لە حزووری پەروەردگاردا بە ئیخلاسەوە دۆعای خێرمان بۆ بکەن، چونکە موحتاجی دۆعاین...

سەروەت عەبدولا

١٦/رەمەزان/١٤٣٣

٢٠١٢/٨/٤

---

* ) خوێنەر دەتوانێت بۆ زیاتر شارەزابوون لەم بارەیە: بگەڕێتەوە بۆ کتێبی (بریسکەکان)ی، (مامۆستا سەعید نوورسی)، لاپەڕە (٣١٧——).

❁ پەروەردەکردن پێش فێرکردنە...

******

❁ پەروەردە بەکورتی عیبارەتە لە: دروست کردنی شەخصییەتی هەر ئینسانێك, دروست هەروەك ئەوەی وەریگرتووە.

******

❁ نەخۆشی تاکی ئیسلامی کەمی سەرچاوەی دینی و کتێب و زانستی ئیسلامی نییە، بەڵکو نەخۆشییەکەی ئەوەیە پەروەردەیەکی دروستی نییە.

******

❁ تعلیم الکتاب: واتە پەروەردەکردنی شەخسیەتی زهنی ئینسانە.

تعلیم الحکمە: تەواو پەروەردەکردنی عەمەلی (کرداری) ئینسانە, واتە ئەوەی وا وەریگرتووە ویژدانی لە ڕوی فکری و ئەخلاقیەوە چۆن جێبەجێ بکات.

******

❁ ئەوەڵین مەتتڵەبێك لە قورئان, کە لە دەورانی رسالەتەوە, واتە لەو کاتەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) دوای پەروەردە کردنی خۆی مەئموریەت پەیدا دەکات بۆ پەروەردەکردنی ئومەت, یەکەمین شتێك کە دەیهێنێت بۆ پەروەردە کردنی ئومەت (سورەتی فاتحەیە). بە ڕاستی تەواوی ئەوەی وا مایەی سەعادەت و عەزەمەتی ئینسانە لە سورەتی (فاتحە)دا جەمە.

******

❁ خۆشەویستی باش ئەوەیە، کە کابرا خراپە تۆ بێیت باشی بکەیت، نەك پشتی لێهەڵبکەیت، بەڵکو تەنها لەبەرخاتری خوا لێیی ببورم و خۆشبم لێ، {بەشکوم} ببێتە هیدایەتی خوایی بۆی.

******

❁پەنا بەخوا ئەگەر لە نوێژدا و لە مەقامی تەحیاتدا بڵێم: "السلام علینا و علی عباد الله الصاحین" ـ سەلامی خوا لەسەر هەرکەسێك کە بەندەی صالّحی خوایە ـ ئەمە بڵێم و بەدڵ وانەبم و سەلامەتی هەرکەسێکم پێخۆشنەبێت، کە بەندەیی صالّحی خوایە، ئەگەر وانەبم ئەوە ئەوکاتە یان هیچ و پوچیی دەڵێم، یان موونافیقم و درۆ دەکەم لەگەڵ خوادا! پەنا بەخوا ئەگەر بڵێم: " السلام علینا و علی عباد الله الصاحین "، بەڵام جگە لە فلآنەکەس لەبەرئەوەی ئەو کۆمەڵ و خەتێکی دیکەیە و بۆچوونی وەك بۆچوونی من نییە، ئەی قوڕبەسەر نوێژ و کۆتایی هێنانی نوێژەکەم.

******

✿ هاوار بۆ ئەوکەسانەی داعییەی دینین و پێشەوای خەڵکی بگرنە ئەستۆ بەرەو دین، کەچی بەگیان و بە دڵ دۆعای خێرنەکەن بۆ فلآن (موئمین)، لەبەرئەوەی لە خەت و دەستەی ئەمدانییە.

******

✿ من لە تەمەنمدا دووجا زیندانی کراوم و هەردووجارەکەش بۆتە مایەیی خێر، جارێکیان لەسەردەمی حوکمەتی (شاه)دا، لەبەرئەوەی زۆر شپرزەو بێبەرنامە بووم و هەوڵو کۆششم بێسەروبەرب وو، هەڵەم زۆر بوو، لە زینداندا ڕاچڵەکیمی و بە هەڵەکانی خۆم زانی و ڕێك و پێکتر هاتمەوە مەیدان. جاری دووەم لەسەردەمی حوکمەتی ئیسلامیدا، لەمەشدا شتێکی دیکەم دەرککرد، لە مێژووی دیندا (سێ دەستە) هەبوون، کە هەر دەستەیەکیان پێیان وابووە خۆیان ڕاستدەکەن (خوا لە موخلیصەکانیان خۆشبێت):

١. عارفەکان ـ عرفاو-

٢. زاناکان ـ علماو-

٣. سەرانی تەکییە و خانەقا ـ متصوف ـ

(خوا پلەی موخلیصەکانیان بەرزبکاتەوە، و گوناهکارەکانیان ببەخشێت، و زیندووەکانیان هیدایەت بدات). نەخێر دینی موحەممەد(ﷺ) ڕێگایی هیچ یەك لەم سیانە نەبووە و ئەمانە هەڵە و خەتایان زۆر، ڕێگەی موحەممەد(ﷺ) بڕوا و بۆچوونی چاکی ئەم سێ دەستەیەیە لەگەڵ شتێکی دیکەدا، کە ئەویش (جیهاد)ێکی بەردەوام و لەناوبردنی (باطل)ە ـ گەورە و بچووك ـ و دامەزراندنی دینی خوا، کە هیچکامیان ئەو جیهادەیان نەبوو.

******

✿ گۆشەگیریی و دابڕان لەخەڵکی پێچەوانەی ڕێگەی خوایە، هەرچەند زۆر عارفی خوێن شیرین وایانزانیوە گۆشەنشینی و خود پەروەردەکردن بەمانایی کارەو ئیرەو ئیتر حەقیان بە خەڵکەوە نییە.

******

✿ (١٥–٢٠) نەفەر بەغیرەت و ئازا پەروەردە ببێ دەتوانێت کۆمەڵگایەك بجولێنێت.

******

✿ جیاوازی کار ئێستام {مەبەست دوایی زیندانی حوکمەتی ئیسلامییە} لەگەڵ ڕابردوومدا ئەمەیە: ئینسان پەروەردە بکەم نەك ئینسانی زانا، ئەمەش گۆشەگیری و دابڕان نییە لە کۆمەڵ، خوا نەیکات من لە خەڵکی داببڕێم.

******

✿ ئەو گشتە تاوانەی بینیمان لەم ئینسانگەلەوە, هۆکاری ئانەوە بوو لە کاتی خۆیدا فێری بێڕەحمی و تاوانکردن بوون, کە گەورەکان گشتمان خەتاکارین, چ نیسبەت بە منداڵی خۆمان, چ نیسبەت بە منداڵی باقی موسوڵمانگەل. هەر منداڵێك دەبینرێت لەناو کۆمەڵگەیەکدا و, کارێکی ناڕەوا دەکات, هەر موسوڵمانێك بەرپرسە, چ باوك و دایکی, چ باقی موسوڵمانگەل, کە ئاگاداری بکانەوە...

******

❁ گرنگی فێرکردن فەرعە نیسبەت بە گرنگی پەروەردە کردن, واتە ئەگەر خوێندەواری و زانیاری هەبێت، بەڵام پەروەردە کردنێکی دروست نەبێت ئەو کاتە خوێندەواری سودی نییە و، بەڵکو دەبێتە ژەهر و زەرەر.

******

❁ ئێمە دوو جۆر ڕشد(گەشەکردن)مان هەیە:

١. گەشەکردنێکی سروشتی، کە بریتیە لەوە کە ئینسانێك دەگاتە تەمەنی (٢٠ ساڵ) جیسمی سالم و هێزی هەمووی هەمەجۆرو فکری کامڵ و ئەوانە...

٢. گەشەکردنێکی تەربێتی(پەروەردەی)، کە بریتییەلەوەی ئینسان بە بۆنەی خوێندن و دەرس یان هەر جۆرە بەرنامەیەکەوە فێری دەبێت .

******

✿ ئەگەر خانەوادە خاس بێت, کۆمەڵگەش خاس دەبێت، ئەگەر خانەوادەگەل بیانزانیایە خۆیان ئیسلامی پەروەردەبکردایە, بەچکەی ئینسانیان پەروەردە بکردایە, مەوجوداتێکیان پەروەردە بکردایە کەمەعنای ئینسانیەتیان بزانیایە, شەفەقەیان ببووایە, عاتیفەیان ببوایە, لەکۆتایداو لەسەر ئاستی کۆمەڵگەش وایان لێ نەدەهات بچن

بەچکپشیلەو توتکەسەگ بکوژن و, لە کۆتایشدا وایان لیّ نەدەهات ببنە ئەو تاوانکارانە...

- ئەگەر کورو کچ، لە جیهانبینیاندا جیاوازییان هەبێت لەدەیەها مەسئەلە لەمەسائیلی تردا تەوافوقیان هەبێت هێشتا بەیەك گەیشتنی ئەم دووانە بۆ زەواج سەرکەوتوو نابێت!

******

- گەورەترین لەشکرێك کە خوای گەورە بینێرێت بۆ ئینسان ئەو لەشکرە ناوەکییەیە(باطنی) کە دەبێـە هۆکاری ئەوەی لەسەر(حەق)محکەم بێت. ئەوە گەورەترین لەشکرە لە لەشکر و عامیلگەلی خارجی هیچ کامیان وەك ئەو نییە وەك لەجەرەیانی(بەدر)دا لەشکری ئاشکرای لە(مەلائیکە) (سەلامی خوایان لەسەربێت) ناردووە و، لەپاشانیشدا (باران و با)ی لەڕووداوەکانی تردا{نارد}... خۆیشی ئەفەرمێت"خۆ ئەمانە نین هۆکاری قودرەتی ئێوە, هۆکاری قودرەتی ئێوە خوایە و لەشکری خوایش فراوانە, کە گرنگترینی ئەوەیە دەینێرێت بۆ (قلوبی ئینسانی موئمین).

******

- (تەبزیر): واتە(نیعمەت لەکیسدان) تۆ بۆچی لەناو قاپەکەتدا میقدارێك خۆراك دەهێڵیتەوە تاوەکو دواتر بیڕژێنن؟ دەتەوێت هونەر بنوێنیت؟ تۆ دەرکی ناکەیت ئەگینا ئائەو میقدارە خۆراکە لەدەمی منداڵێکت سەندۆتەوە! ئەگەر پەیوەندییە لەدورەوەیە و دەرکی ناکەیت, کەمێك نزیکی ببەرەوە, منداڵی برسی زۆر هەیە کە ئائەو چکە خۆراکەی لەناو قاپەکەتدایە بیدەیتیّ, وەکو گەورەترین غەنیمەیە بۆی! پەیوەندییەکە نزیك بکەرەوەو بیهێنە بەرچاوی خۆت کەئائەو (دەورییە) خۆراکە لەبەردەمی منداڵێکی برسیدا دەیەوێت بیخوات‌و تۆ خەریکی دەیبەیت دەیڕێژیت!ئەم هەموو زەرەرو فەسادییە بۆ؟

******

❁ ئەگەر ئینسانێك گەیشتە ئەوەی كە﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾ی بەڕاستی﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾بوو، ئیتر ئەو كاتە بەڕاستی ئینسانە! ئیتر ئیمكانی نییە لە هیچ شتێكیدا لە كرداری(باطن و ضاهیری)دا شتێك هەبێت كەزەرەر بەخۆی و، ژن و مندالّ و هاوسێ و بەكوللی بەشەر بگەیەنێت! ئیمكانی نییە شتی وا ڕوبدات.

******

❁ بكۆشن بە ئومێدی خوای گەورە لەسەرەتادا بەندەی (دەرون و هەوا و هەوەس)ی خۆتان نەبن, جا لەپاشانیشدا بەندەی عەواملی خارجیش نەبن، تەنها و تەنها بەعەقلّ و عیشق و دلّیش بەندەی خوابن و بزانن تەنها و تەنها تام و مەزە لەوەدا هەیە، كە: تۆ گوێڕایەلّی خوابیت و هیچ شتێكی تر تام و مەزەی نییە، هەروەها هیچ شتێكی تریش عاقلانە نییە.

*******

❁ ڕۆلّەكانم! هەرچی هۆكارە بۆ مندالّ ئەوەیە(باوك و دایك) واقیعەن صالّح و پاك بن، ئەگەر دایك و باوك هیچ نەلّێن و باسی هیچیش نەكەن بۆ مندالّ تەنها خودی ئەمەی باوك ڕەفتار و حەرەكات و سەكەناتی و قسەگەلی، و دایك ڕەفتار و حەرەكات و قسەگەلی گشتی دروست و پاك و موبارەكبێت، خودی ئائەمە نوورە و دەڕێژێت بەسەر مبدالّدا و جیهەت دەداتە مندالّ، بۆیە لەپێش هەموو شتێكەوە ئەوە گرنگە كەخۆیان واقیعەن صالّح بن..

******

❋ ئەساسـی (پـەروەردەی دینـی) ئەوەیـە
هەندێك شت كە ئصولّن, و ناسینی ئەساسی و ژێربینایین بۆ ناسینی مابـاقی شـتەكانی دیكە, ئەویش ناسینی(ڕازی هەستییە) نهێنییەكانی هەستی, كەئەم هەستییە لەخۆیەوە شكڵی نەگرتووە, لەخۆیەوە بەوجود نەهاتووە، ئەمە ئەوەڵێن كەلمیەو ئەوەڵێن تەحلیل و ئەوەڵێن وەڵامە كە ئینسان دەیدۆزێتەوە لەبارەی ئەمەوە كە(هەستی چییە؟)..

******

❋ ئینسانەكان بەزۆری دووچاری هەڵەكردن دەبن و, وادەزانن (زانین) یـان بـە دەربڕینـی ئەمڕۆ(فەرهەنگ) هۆكاری ڕزگاركردنی ئینسانگەلە، لەكاتێكدا عـەجیب هەڵەیـەك دەكـەن! نە زانین و نە فەرهـەنگ هـیچ كامیـان هۆكـاری خۆشـگوزەرانی ئینسـانییەت نییـە! فـرە فەرهەنگەلی فراوان و گەورەمان هەیە فرە میللەتگەلمان هەیە خاوەنی فەرهەنگەلی یەكجار گەورەن. بەڵام چی پەروەردەیان نییە و پووچن!...

******

❋ بێگانـەیی (دەرونـی نائاگـا) لـە (دەرونـی ئاگـا) دەبێتـە هۆكـاری ئـەوەی، ئینسـان بەوجۆرە دوو كەسایەتی(ازدواجییەتی شەخصییەت) لە كەسایەتیدا وجودی هەبێت!

******

❋ بۆئەوەی ئەرزشی كەسایەتی ئینسان دروست ببێت (سێ) صـیفات و خـەصڵەت مەترەحە:

یەكەم: مەعریفەت

دووەم: جیهەتگیری

سێیەم: ڕەفتار و كردار

❀ دروست بوونی شەخصییەتی ئینسان دەکەوێتە پێش لە دایك بوونیشییەوە! بێژین لەزەمانێکەوە کە ژیان دەکرێت بەبەری(تۆو)دا و (جسم و ڕەوان) مانا پەیدا دەکەن... لەوانەیە پێش ئەوەش! خۆ لەڕووی هەندێك لەبنەمای ئیسلامییەوە ئیحتمالی

پێش لەوەش هەیە، چونکە هەندێك لەئەحکامی ئیسلامی هەیە ڕوودەکات لە(گەنجێك) کەهێشتا ژنی نەهێناوە (کوڕێك یان کچێك) کەهێشتا هاوسەرگیرییان نەکردووە، ئەمەش لەبەرئەوەی ئەوەی ئایندەیان باش بێت! بۆئەوەی لەئایندەدا منداڵەکانیان سالم بن، چ لەڕووی جەستەییەوە، چ لەڕوونی دەروونییەوە دوچاری گرێی دەروونی و دژایەتی سەخصییەت نەبن!

******

❀ ئیسلام ئەم واقیعیەتە دەرك دەکات و دەزانێت (ئینسان) خۆی حسابە و، کاتێك کۆمەڵگەیەك نەخۆشە لەبەرئەوەیە (ئینسان)ەکە خۆی نەخۆشە, فکر و ئەخلاقی نەخۆشە! بۆیە دەست دەکاتە دروست کردنی (ژێرخان).

*******

❀ ئەو مرۆڤەی وا کەوتە شوێن شەهوەت و هەوەسبازی تێیهەڵدەو بەزۆر پێی بڵێ هەستە جیهاد بکە و لە حەق دیفاع بکە لە دین و ناموست دیفاع بکە (هایی هوو سەرەیی یەت) و ناتوانێت.

******

❀ لەپێوانەکردن لەنێوان (مادەو مەعنەویەت)دا لەگەڵئەوەی هەردووکی گرنگ و پێویستە بۆ ئینسان. بەشی گرنگتر لەشەخصییەتی ئینساندا کەلە حەیوان جیای دەکاتەوە بریتییە لە(ماوەرای مادە) واتە(ڕۆح)ی لەبەرئەوەش

(مەعنەوییات)سازگارە لەگەڵ ڕۆحدا بۆیە ئەو گرنگترە. بەشی بێبایەخیش بریتییە لە(جسم)ی ئەو شتەش کەپەیوەندی بەجسمەوە هەیە بریتییە لە(مادییات) و ئەو بێئەهمییەترە. ئێژێ: ئەگەر ئینسانێك تەنها لەڕووی جسم و مادییەوە پەروەردەی بکەیت دەبێتە(پاڵەوانێکی کەر و بێ شعور)، بەلاَم لەڕووی ڕۆحییەوە پەروەردەی بکەیت دەبێتە یەك ئینسانی نمونەو گەورە, هەرچەند لەڕووی جسمیشەوە(لاوان)بێت هەڵبەتە ئەوە بەمانایی ئەوە نایەت ئەو لایەنی ڕۆحی بۆ مەترەح نەبێت و ئەمیش لایەنی مادی بۆ مەترەح نەبێت.نا...لایەنی ڕۆحی لەویشدا هەیە و لایەنی مادی لەمدا هەیە, بەلاَم زیاتر سەرنج دان بەلایەنی مادی ئەمە دەستکەوتەکەیەتی و زیاتر سەرنج دان بەلایەنی مەعنەوی ئەوە دەستکەوتەکەیەتی, بۆیە دین ئێژێت: دەبێت هەردووکی هەبێت, دەبێت نە مەعنەوییات ببێتە(تاغوت)وەك کار و کرداری(راهیبگەل) و نە مادییات ببێتە(تاغوت)وەك کار و کرداری تاوانبار و بێشەرەف و خۆفرۆشگەل, دەبێت هەر کامییان بەئەندازەیەك کەپێویستی ئینسانییەتە سەرنجی بدرێت، بەلاَم ئابەو جۆرە تێڕوانییە کەهەیەتی, کەلە دژایەتی نێوان مادییات و مەعنەوییاتدا ئەرزشی گەورە بۆ مەعنەوییاتە، ئەگەر وابێت مادییات فیدای مەعنەوییات دەکرێت...

******

❁ لەتەرزی تەفەکوری دینیدا مادییات پێویستە بۆ ئینسان، بەلاَم بەناونیشانی(بایەخی دووەم) و بەو ناونیشانە کەهەتا ئینسان تەواوی مادییاتی بکاتە قوربانی بۆ بایەخی مەعنەوی ئەمە هیچ, تەنانەت (جسم)ی خۆیشی بکاتە قوربانی بۆ بایەخی مەعنەوی دەبێت, کاتێك بەم فکرەوە ئینسان پەروەردە بکەیت, ئامادە بێت تەواوی مادییات و جسم و گیانیشی فیدا بکات بۆ بایەخگەلی مەعنەوی چەنێك سادە دەبێت، ئەگەر پێی بێژی:"تۆ لەبەر بایەخگەلی مەعنەوی کار بکە,

بــەلاَم کەســێکی تـــر بیخــوات". چـــەنێك پەیوەندی هەیە لەنێوان ئەم(ژێرخانی فکری)ە لەگـەڵ ئـەم(سـەرخان)و بەرنامەیـەدا پەیوەندییەکی(سروشتی و زانستی)یە...

******

✿ بۆچی لە تەشکیلاتی سیاسی دەترسم؟

فرە تەوزیحی ئەم پرسیارەم داوە, ئەگەر کەسێك (منـداڵێك) هێشـتا توانـای ئـەوەی پەیـدا نـەکردبێت میـوە جـوان بگرێـت بـە دەسـتەوە (پرتـەقاڵێك بـاش بگرێـت بـە دەستەوە) و تـوانی ئـەوەی نـەبێت بـەم دەسـتەکەی تـری بـەکاری بهێنێـت, چـەقۆ بدەیتە دەستییەوەو بێژی: ئەو پرتەقاڵـە پـاك بکـە دیـارە زەرەر لـە خـۆی دەدات. تەزکیە بۆ ئینسانییەتی ئینسان وەك ئەو تواناییەیە کە منداڵ هەیەتی بە دەستێکی پرتەقاڵ بگرێت و بەدەستەکەی تری پاکی بکـات! ئینسـان تەزکییـە نـەکرابێت کاتێـك تەشکیلات دامەزرا و بووە بەرپرسی گەورە لەناو ئەو تەشکیلاتەدا, ئەوانەی لـە خـوارن جۆرە نەخۆشییەك دەگرن، ئەوانەی سەرەوەن جۆرێکی تر.

کە من مەبەستم ئەوانەی سەرەوەیە، ئەوانە وا لەناو تەشکیلاتێکدا دەبنە بەرپرس و شوێنێك پەیدا دەکەن و ژمارەیەك لە خـەڵکی قسـەیان لـێ وەردەگـرن سـادەترین و قەتعی ترین نەخۆشی ئەوەیـە کـە: دووچـاری غـروورو قـودرەت تەڵـەبی دەبـن, واتـە ڕشتەگەلی جۆر جۆر لە (ئیستکبار ), ئەمە یەك. دووەمین ئەوەیە بـە فرِوفێڵـەوە بـۆ کەموکورییـەکانی خـۆی کـار دەکـا, زۆر سـادەو سـەریح و وەك مرۆڤێکـی بـەرپرس مەبەستی خۆی ناڵێت, دەی جارێـك فرِوفێـڵ و جـارێکی دیکـە, چـکە چـکە, درۆزن، کەڵەك و فریودان دەبێتە ئەصڵی مەتڵەب.

*****

✿ هیچ شتێك شك نابەم لێی بترسم! لەچی بترسم , بترسم لە عەزابی خەڵك؟ بترسم نەوەکا خەڵك, مەخلوق عەزابم بدەن؟! باشە دەی ئەگەر خەڵك عەزابم دەدەن ئەو

پەڕەکەی چوار ڕۆژ، چوار ساڵ، سەد ساڵ تەمەنم لێ بسێننەوە, ئەوەی خاوەنی دنیاو ئاخیرەتە لێم ڕازی بێت, ئەم مار و مێروە وا لە دنیادان و خۆیان بەشت دەزانن هیچێك نین و خەوخەیاڵێکە چوار ڕۆژە دامەزراوە با هەر بیبەن.

********

✿ مرۆڤ خاوەنی دوو جۆر رشد(گەشە)کردنە: گەشەکردنێکی سروشتی، کە تایبەتە بەلایەنی جسمانی و مادی مرۆڤ، گەشەکردنێکی پەروەردەیی و مەعنەوی.

********

✿ ئەگەر پێشکەوتنی مرۆڤ تەنها لەڕووی مادییەوە بێت و ڕووی مەعنەوی لەگەڵدا نەبێت، دەبێتە بەڵاو موصیبەت بۆ سەرشانی بەشەرییەت، جا بەشەر هەرچی هێزی زیاتربێت ئەگەر بێ و (دین)ی لەگەڵدا نەبێت کۆنترۆڵی بکات و هێزەکەی بخاتە خزمەتی بەشەرییەت، ئەوە زیاتر بەدبەختییە بۆ بەشەر..!

********

✿ ئینقلابی دینی، ئینقلابێکە تەدریجی، نەتانەت فێکردنەکانیشی هەر تەدریجین، بۆنمونە ئینقلابی ئیسلامی خۆ یەکسەر فێرکردنەکانی لەلایەن خوای گەورەوە نەهات و بیرژێنێتە کۆمەڵگەوە، بەڵکو تەردریجی وردە وردە، واتە پەروەردە و فێرکردنەکە بەیەکەوە بوون، نەك ئەوەی بەشێکی زۆر زانیاری بخاتە ناو کۆمەڵگەوە، کە خەڵکی هەروا بەسەریدا تێپەڕن و بەبێتەرکیز و تەوەجوهکردن تێیپەڕێنن و شەخصییەت و ئەخلاقیات و زاتیاتێك لەگەڵ ئەو زانیاریانەدا پەیدا نەکەن، کارێك ئاوابکرێت هیچ سودێکی نییە بۆ کۆمەڵگە، هەمیشە وتوومانە: بەڕاستی بەدبەختی خەڵکی لە ئەنجامی کەمی کتێب و کەم زانست و زانین نییە، بەڵکو کەمی پەروەردەکردنە!

********

پەروەرش دەکات، له پاشاندا کۆمەڵگەی پێدەسپێرێت, ئاخر برا تۆ حکومەتێك دەڕوخێنیت لەوە و دوا کۆمەڵگە بە کێ بەڕێوە دەبەیت؟

********

✿ کاتێك لە جێگەیەکدا فەزایەکی عیلمی هەبێت و لە پاڵئەمەشدا ئەخلاق و شەخصییەت وجودی هەبێت بەشێوەیەکی ئاسایی کەس ڕوونیایەت (جیدال)بکات لەسەر قسەی ناحەق.

********

✿ ئیمکانی نییە تەعریفێك له ئینسانێك بە ئەندازەری ﴿وَإِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾ {القلم٤} ڕەفاه بێت! بە مەرجێك بزانیت ئەخلاق چییە. ئەخلاق سەمەرە و گوڵی ئیمانە، واتە: تەواوی ئەوەی وا خەصڵەتی ئینسانی بێت و مەوجودێك مەخلوق بەناوی ئینسا بتوانێت تێیدا کۆ (جەم) ببێتەوە لە تۆ(ئەی محمد -ﷺ-)دا کۆبۆتەوە، هیچ خەصڵەتێکی ئینسانی نەماوە ئەو ئایەتە نەیگەیەنێت!

********

✿ بەشەرییەت بۆئەوەی لەم دەرود و ئافاتانەی کە تێیکەوتووە ڕزگاری ببێت دەبێت دوو ڕێگە بگرێتە بەر:

١. ناسینی ئیسلامی حەقیقی (ئەمە جیاوازە لە مەزهەب و مەکتەبە ئیسلامییەکان)، هەروەها ناسینی دەرك و عورف و فەرهەنگی خەڵك و قسەکردن بەتەناسوبی عورف و فەرهەنگی خەڵکی، ئەگەر وانەکرێت ئەوا خەڵکی لەو قسانەی بۆیان دەکرێت حاڵی نابێت و دەرکی ناکات.

٢. کۆششکردن بۆ پەروەردەکردنی ژمارەیەك خەڵکی و، دامەزراندنیان لەسەر ئەو ڕێگەیەی ئیسلام دیاریکردووە. (ژمارەیەك کەم یان زۆر ئینسانی موسوڵمان پەروەردە بکەیت، کە باش و تەواو تێگەیشتبن، ئەمانە ببنە سەرمەشق بۆ میللەت و ڕێگەیان بۆ ڕۆشن بکەنەوە).

✿ پـێش لـەوەی باسـێکی دیـاریکراو بکـەیت

پێویستە کارێك بکەیت زهنـی بەرامبـەر ئامادەبکـەیت، بۆئـەوەی گوێچکە شـلبکات بـۆ ئـەو بابەتە.

********

✿ زۆربەی موسوڵمانانی دونیا، چونکە (دیـن)یـان بیرچـۆتەوە و (مەزهـەب) رەواجـی هەیـە هاتوون (مەزهەب)یان لە جیاتی (دین) گرتـووە، بۆیـە زۆربـەی زۆری (مەزهـەب) مەبەسـتیان (دین)ە، لەکاتێکدا زۆر لەیەك جیاوازن.

********

✿ ئێمە هەوڵدەدەین موسڵمانگەلێك انقلابی پەروەردە بکـەین, کـە کـە لـەناو چوارچـێوەی مەزهەبی سوننەدا ئەسیر نەبن و ئـازاد بـن و بێنـە دەرەوە, هەوڵبـدەن حەرەکـەت بـدەن بـە مەردم بەرەو ئیسلامێکی ئینقلابی, کە یەکێك لە کارەکانی و ئەسـڵی کـار ئـەوە دەبێـت, کـە ئەم موسڵمانانە لەناو حەرەکەتەکەیاندا خەڵکی لەوە ئاگادار بکەنەوە، کـە ئێمـە صـلاحیەتی ئەوەمان نییە خۆمان بە خاوەنی دین بناسێنین و بیرو بۆچونەکانی خۆمان وەك دین بەخەڵك بناسێنین, بەڵکو هەوڵدەدەین (شورای ئیسلامی) دروستببێت. لە ضمنی حەرەکەتدا دەبێـت هەمیشە ئەمە جێگەی تەرکیزی موسڵمانانی هاوڕێگەی ئێمە بێت.

********

✿ خۆشەویستەکەم! یەکجار بـەرترە و بـانترە لـە هـەر خزمـەتێکی خـاوێن و، لـە شـوکرانە بژێری بۆ تەوفیقی هەر خزمەتێك، کە: ژیرانە و پسپۆڕانە، سرنجی هەرچی کەلێنی دڵتە بیـدە و،هەر جۆرە جروجانەوەرێکی لێبێ - چ لە بەرا و، چ لەوەختی کارەکەدا و، چ

لەوەودوا - دەری بهێنیت و توڕی بەیت و: وا دڵت پاکەوەکەیت کە: دڵنیـابی: کۆڵەکـەی بـەرو ماڵ و ژیانی بە راسیت، نە پوچەڵی هاتیا و نە کرمۆڵ، بە یانیش خوا لە کردەوەکانت رازییـە و خوەیشت رازیت، "بەڵام ژیرانە، ناخی دڵ دەرێنی".

********

✿ هەرکارێك تا کەورەتربێت درزو برینی زۆرتـر

هەیە بۆ تێخزانی بە پاڵ پسکێ یا وە چاوشارەکێ، وە دزە دزەی شەیتان و هەوا. دەی جا ڕۆڵە خاسەکەم! تو خوا حەیف نییە: فـرە خـۆ بـڕەتێنین و بـەیانی بمـرین، دەسـتمان لـەبن هەوانەی خاڵییەوە دەرچـێ، یـا بچـیتە کەسـافەتا؟ یـا دوو سـبەی هاواربکـەیت: ئـاخ خۆزگا نامەی عەمەڵم هەر بەدەستمەوە نەدریایە؟ شەلاّ هەر نەم بینیبا: کۆڵەکەم چی تێدایە؟

********

✿ ئەگەر بە دەردی داماو و برسی

بە حاڵی دیبل و مەزڵووم بزانیی،

چە هەلاّی هەولّت هەر ژینی خۆ بێ

بەخوا حەیفە خۆ وە انسان دانیی

********

✿ شەیتان حەزئەکا فیزن و مۆن بیی

ڕەزای خوایش لەسەر ئەخلاقی جوانە

جا سێ و دووی دڵ خوەت بکە: ئارەزووت

بەرەو ڕێگەی خوا یا لای شەیتانە

********

✿ ئەگەر هەژاران لەبەر هەژاریی

خەڵەتیان تفیان لێت کرد مەیگرە دڵ

حەکیمێ دڵسۆز، منالّێ نەخۆش

هەزار جنێو با ناکەوێتە سڵ

خەتەرەت بیێ لە ئیمانی خۆت

ئەر بۆ داماوان دڵت نەیتە کوڵ

✿ گیانە پێت خۆشە موسوڵمانێ بیی

خۆشەوییسی خوا و هەرکە انسانە

خاسیی خەڵك نەختێ، بە فرە بگرە
چاکەی خۆت زۆری، بە کەم بزانە
توقع لە خۆ زۆر، لە مەردم کەم
سەرمایەی بەرزیی هەر دوو ژیانە
********

✿ چاوم تێکۆشە خزمەت کەیی بە خەڵك
بە دەم بە قەڵەم بە هەنا و بە ماڵ
باشتر لە گشتیی: بە ڕێگە خستن
بەرەو خۆشبەختیی ئەم ماڵ و ئەو ماڵ
دونیای خەڵك و هەتا هەتای خۆت
خۆش بێ چش با هەر دنیا ببێ تاڵ
********

✿ ئامان گیانەکەم دەسمە داوێنت
هەوەس ماقووڵیی نەکەویە شوێنت
بەڵێ (اسراف و تبذیر) خوێنتاڵن
بەلآن بێ هەوای ماقووڵیی، کاڵن
هەوای زلەبوون، ڕێ ژیینی بەرچاو
ئەنێتە بەرت، چ خاس چ خراو
کەم هەڵ ئەکەوێ وە بێسەرمایە
استکبار، اتراف دامەزرێ پایەی
✿داری بێبەر بەو و وەحسی بۆ خۆت
نە لەقت ئەکێشن نە پەڵ ئەخەن بۆت
داری بەرداری؟ ئیتر بەرپەڵ بە
لە سەرخۆ وچان لەسەرخۆ دەرکە
تا ژیرێك بەجێ ئەچنێ بارت
صەد گەوج و چڵێس ئەدەن ئازارت

********

✿ تووتەکوڵەیێ لە گەڕەمانا،

نازانم چۆن بوو دایکی بریا لێ

دەڵێ* تووتکدار بردی بۆ لای خۆی

وەك بەچکەکانی، خزمەتی ئەکرد پێ

دڵێ بۆ داماو نەقرچێتەوە،

مەزڵووم هاوار کاو، ئەو دانەچڵەکێ،

پێی دڵخۆش مەبە ئەوە دڵ نیە

قەزای ئەو دەڵەی صەد جار لێ کەوێ

********

✿ ماشەڵڵا کۆکی، سازی، تەیاری

ئەلحەق کوێرایی چاوی نەیاری

بەڵام ڕۆڵەگیان! ئەر بۆ ئەمو ئەو ئەژیی،

وەوییلکەی. تاپلۆی، شیعاری

********

✿ هەر نەختالێکی بەش هەژارێکە

ئەو نەختە چێشتە وا لەکیسی ئەدەیی

دەی جا گیانەکەم مەگەر دوور لە تۆ

دوشمن بەشەری؟! بۆچی وا ئەکەیی؟

✿ خودایە ئەگەر دەکرێت هەموو دەردەکانی عالەم بدە بەسەر مندا تا کەسێك دەردەدار نەبێت.

********

❀ دروست بوونی گۆڕانکاری لە کۆمەڵگەدا فەرعییە و تابعی گۆڕانکارییە لە تاکدا، دەبێت لەسەرەتادا تاك بگۆڕێت...

---

*) دەڵێ (دەڵ): بەو سەگە مێیە دەگوترێت، کە بەچکەی هەیە...

******

❁ ئیسلام، هەر تەنها عیبارە نییە لە ئایدۆلۆژیا, عیبارەت نییە لە بەرنامەیەکی فیکری, عیبارەتە لە سیستەمی سیاسی، سیستەمی کۆمەڵایەتی، سیستەمی ئابوری، عیبارەتە لە سیستەمی پەروەردەی و سیستەمی پەیوەندیەکان لەناو کۆمەڵگەدا و سیستەمی پەیوەندیکردنی کۆمەڵایەتی لەگەڵ ئەوانی دیکە. ئیسلام کۆی ئەوانەیە...

******

❁ گرنگترین شت بۆ تاك و کۆمەڵگە بریتییە لە پاراستنی هاوسەنگی: مەبەست لە هاوسەنگی ئەمەیە، کە بۆ هەر تایبەتمەندییەکی مرۆڤ (مادی و مەعنەوی) زیادە رەوی نەکرێت، هەر یەکە لەم تایبەتمەندییانە دووچاری زیادەرەوی و کە رەوی نەبن، یەکێکیان فیدای ئەوی دیکەیان نەکرێت.

******

❁ کاتێك کەئیسلام هاتووە و ڕووبەڕوو دەبێتەوە و - چارەسەری کێشەدەکات - مانایی ئەوە نییە بۆنمونە لەگەڵ کۆیلایەتیدا ڕووبەڕوو دەبێتەوە، بەڵکو ڕووبەڕووی ژێرخانگەلێك دەبێتەوە کە لەعەقیدە و دەرك و فیکر و فەهم و تایبەتمەندییەکانی ئەخلاقی ئینسانگەلدا نفوزی کردووە!

******

❁ کۆمەڵگەی ئینسانی هەر نەخۆشێکی هەبێت ڕێگەی چارەسەرکردنی ئەو نەخۆشییە ئەوەیە کەخودی ئینسان چارەسەر بکەیت، چونکە نەخۆشییەکە لەخودی ئینساندایە، هەر ئەمەشە بۆتە هۆکاری ئەوەی وا نەخۆشی کۆمەڵایەتی دروست بووە.

❁ ئەگەر بەتەواوی هێزی مەعنەویەت لەگەڵ خودا نەبێت ئەوە هیچ نییە خوا ناسینێکە وەك یەك بیرمەند پێیدەگەیت، کە ئەمەش بەس نییە بۆ ئینسانی موسڵمان، هەروەها خوا ناسینێك کە عارفێك پێیدەگات بەس نییە بۆ بیریارێکی موسڵمان, خوا ناسیینێك، کە دەروێشێکی بێخەبەر لە مەعریفەت, بەڵام خاوەنی (جەزب) بەسنییە بۆ ئینسانێکی موسڵمان... بەڵکو کاتێك خوا ناسی بۆ بیریارێکی موسڵمان مانای واقیعی خۆی پەیدا دەکات بە تەواوی هێزی مەعنەویەت گەشتبێتە خوا ناسی. ئەوکاتەیە حەرەکەتێکی داهێنەرانە, ئەو کاتەیە ئەم ئینسانە دەتوانێت ببێتە موسڵمانێك.

******

❁ ئیسلام (ئینسان) دروستدەکات, نایەوێت بە کوتەك و بە شەر بیکات بە بەشەر, بەڵکو بە دەرکی, واتە ژێر بینایی دروستدەکات, کە ویژدان و دەرونی ئینسانە.

******

❁ ئیستعدادگەلی ئینسان بێ پایانە، ئەگەر مەوجودێکی بێ ئیستعداد بوایە وەك حەیوان خراپیش بوایە هیچ نەبوو, بەڵام ئەم ئینسانە بەم کۆمەڵە ئیستعدادەوە ئەگەر بەرنامە و ڕێوشوێنی نەبوو دەبێتە ئەم ئافاتگەلەی ئێستا دەیبینین! بەشەرگەلی زانایی خاوەن ئیستعداد، چونکە بەرنامە و ڕێگەیەکی دروستیان نییە ئەم عیلم و ئیستعدادەیان دەبێتە هۆکاری حوکم کردنی قودرەتگەلی ئیمپریالیستی لەدونیادا, دەبێتە هۆکاری هەرچی زیاتر کارکردنی کارخانەکانی ئیتسعمارگەل دەبێتە هۆکاری سەرهەڵدانی دەزگاگەلی جاسوسی بۆ زەجر و ئەشکەنجە و ئازاری

ئینسانگەلی مەزڵووم! ئەم مەوجودە مەوجودێك نییە بەبێ بوونی بەرنامە بەڕێوە ببرێت.

******

❀ هەرچی شتمانە بێگانە بوونە لە "ئیسلام"، ئەم بێگانەییە بە جۆرێکە بۆتە مایەیی بێماناکردنی زۆرێك لە مەراسیمەکانی ئیسلامیش! چونکە، ئێمە ئەوەندە بە غیرەت نین بڵێین کەسێکی موسوڵمان نین و کار بە ڕێنماییەکانی ناکە، بەڵکو خۆمان بە دیندار دەزانین، بەڵام دیندارێك کە خۆمان مەبەستمانە و بڕوامان پێیەتی نەك ئەو (دین) و موسوڵمانییەتییەی بۆمان هاتووەو لێمان داواکراوە، بۆیە لە کۆتایدا ئەوە دروست دەبێت ناومان موسوڵمان بێت، بەڵام ڕەفتارمان بێگانەبێت بەدین!

******

❀ ئەمەی کە ئێستا دەیبینن، ئەم گشتە بەدبەختیو قوربەسەرییە وابەسەری دێت بەرهەمی ئەوەیە کە ئینسان بەرنامە بۆ ئینسانگەل دادەنێت،. ئینسان صەلاحییەتی نییە بەرنامە بۆ ئینسان دابنێت, چونکە بەرنامە دانان مەسەلەی ناسینە, دەی ناسینی نییە و ناشتوانێت بیبێت، کەواتە ئەوە دروستکەری ئینسانە کەئەم مەوجودە عەجیبەی دروست کردووە, ئەم دەزگا گەورەی خەلق کردووە دەتوانێت بەرنامە دابنێت بۆ ئینسان.

******

❀ ئەوە بزانن هەر جیلوەیەکی دەوڵەمەندی وەك داهۆڵێکە بۆ داچڵەکاندن و ترساندنی دڵی هەژار و فەقیران!

---

❁ ئیسلام لەسەرەتادا بەشەری ڕێك و پێك کردبوو، ئیسلام بەشەری وا ڕێکوپێك دەکان هەرچەند زۆر بێت ئاسان بەڕێوەدەبرێت. بەڵام کاتێك ئیسلام نەبێت بەڕێوبردنی (چوار) نەفەریش کێشەیە، جا گیانەکەم ئەگەر ئیسلامی ڕەفتار بکەن باش دەڕۆن بەڕێوە، ئەگەر ئیسلامی ڕەفتار نەکەن هەر دەیکەنە هەراو بەزم و باش بەیەکەوە ئیدارە ناکەن.

******

❁ مرۆڤ لەسەردەمی جەنگەڵدا بەدەست حەیوانی دڕەندە و تۆفان و ڕەشەبا و سەرما و گەرماوە رەنج و عەزییەتی دەبینی، جا هەرچیش بوو قابیلی تەحەمول بوو، ڕزگاربوونیش لێیان ئاسان بوو، بەڵام لەم سەردەمی شارستانییەت و پێشکەوتنەدا مرۆڤ بەدەست مرۆڤەوە گیری خواردووە و ئازار دەچێژێت! بەدەست داگیرکەرانەوە ئەشکەنجە دەدرێت، ئێستا مرۆڤگەلی برسی {هەژار و نەدار و بێدەستەڵات}، کە دەڵێن "بەشمان مەخۆن"، بە تۆپ و ئاگر وەڵامیان دەدرێتەوە..!

******

❁ پاکترین حاڵەتی مرۆڤایەتی حاڵەتی منداڵە، پاك ترین مرۆڤ منداڵە، موستەحەق ترین مرۆڤ کە خزمەتیان بکرێت ئەو منداڵەیە.

******

❁ بەگشتی بەروبوومی (ئیمان) بریتییە لە(عەمەلی صالح). عەمەلی صالح خۆی زاتەن داغڵی مەفهومی ئیمان نییە, ئیمان بریتییە لە (مەعریفە و جیهەتگیری), بەڵام بەروبومە بەرچاوەکەی, سودە دیارەکەی (ئیمان) دەبێتە عەمەلی صالح، هەر لەبەر ئەمەشە هەمیشە لەگەڵ وشەی ئیماندا (عەمەلی صالح) بەکاردەهێنرێت.

*********

❁ ئینسانی(موئمین)، واتە کەسێك مەعریفەی گەورەیەی بۆ حاصڵ بوو بێت، هەروەها ئەو جیهەتەی گرتبێت کە ئیقتیزای مەعریفەتەکەیەتی، کاتێکیش ئەم (ئیمانە) ئەرزش پەیدا دەکات کە ڕوکنی سێیەم بوونی هەبێت,واتە: عەمەلی صالحە.

******

❁ ئینسانی (کافر)، واتە کەسێك کە مەعریفەی گەورەی بۆ حاصڵ بوو بێت، بەڵام جیهەتگیری ناکات لەگەڵ ئەو مەعریفەیەدا، دەست دەکات بە ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو مەعریفەیەی وەریگرتووە، ئەمەش دەبێتە عەمەلەکەی. واتە کاتێك جیهەتی خۆیی تەتبیق ناکات لەگەڵ مەعریفەکەیدا ئیتر لە ڕوخساریشدا کرداری چاکە ئەنجام نادات.

******

❁ ئینسانی (مونافیق) نەوەك موئمینە، نەوەك کافر... مەعریفەتەکەی هەیە، بەڵام جیهەتگیرییەکەی نەکردووە، کەچی تەماشا دەکەیت عەمەلی موئمینەکەی هەیە!! لەڕوخساردا عەمەلی لە عەمەلی موئمین دەچێت لەکاتێکدا قۆناغی جیاکاری کەسێکی (ئیمان)، یاخود ڕوکنی دووەمی ئیمان، کە بریتییە لە خۆهاوجیهەت کردن لەگەڵ مەعریفەتدا حاصڵ نەبووە, لەوەودواش لە(کافر) دەچێت لەمەداکە جیهەتگیرییەکەی نەکردووە! بەڵام دێت لەمەرحەلەی (سێیەم)دا واخۆی پیشان دەدات کە .خۆی تەتبیق کردووە و ئەو جیهەتەی گرتووە، وەڵێ درۆیە و واقیعییەتی نییە!

******

❁ زەمانێك كە بێحەرەكەت و بزاوت بەسەر وڵات و میللەتێكدا دەگوزەرێ و، ئەو میللەتە هاوارێ ناكات، دەنگێكی نارەزایی لێ بەرز نابێتەوە، زوڵمی لێدەكرێت و ناڵێت بۆچی واملێدەكەن؟ حەق و نا حەق لێك جیا ناكەتەوە و هەموو جۆرە ئیمتیازاتێك بەسەریاندا حوكوم دەكات، سیستەمی تاغوتی و سیستەمی چینایەتی و سیستەمی ئەشرافیەت دەبێتە جێگیرەوەی سیستەمی بێئیمتیاز و بێتەبەقاتی دین. ئەو زەمانە مێژوو راوەستاوە، ئەو زەمانە مەملەكەت نەزۆكە، ئەو زەمانە، زەمان لە جوڵە و ژیان كەوتووە!

******

❁ ئەو مرۆڤانە وا پێشكەش دەكرێن بۆ روخاندن و لەناوبردنی بت و بوتخانەكان, ئەوانە فیدائی ئەو حەرەكەتەن، ئەوانە بە وجودهێنەری ئەو حرەكەتەن، ئەوانە قیسمەتی عەمدەی خالقی مێژووی نوێی ئینسانیەتن!

******

❁ هۆكاری ئەوە كە شەهید نامرێت، هۆكاری ئەوە كە شەهید بە شانازیەوە ناوی دەبرێت، لەبەر ئەو ئیختیارەیە كە مرۆڤ هەیەتی بۆ دروستكردنی مێژووی خۆی، بۆ دیاری كردنی مەصیری خۆی..

******

❁ ئەگەر بریار بێت مرۆڤێك خۆی بە خاوەن ئیمان بزانێ دەبێت خۆی بۆ دەردی سەر ئامادە بكات، ئیمان شیعار نییە, ئیمان لەقەب نییە, ئیمان هێزی بزوێنەری دەرونی مرۆڤە.

******

❁ ئەگەر نوێژت کرد قودرەتت بەهێز دەبێتەوە, هەموو قـودرەتی گـەورە گـەورەی دنیا لە بەرامبەرتەوە بچکۆلە دەبێتەوە، ئەگەر فێر بوویت سەری بەندایەتی بۆ خـوا بنەوێنیت, ئیتر سەرت بەرزترە لەوەی بۆ بەندایەتی کردنی ئەربابی دنیا بنـەوێنیت، مرۆڤی یەکتاپەرست قـەت لـە بەرامبـەری هێـزەوە سـەر نانـەوێنێت، زمـانی مرۆڤـی موئمینی یەکتاپەرست قەد لەبەرامبەر زۆرەوە بێدەنگ نابێت.

******

❁ بە هەر ڕێگەیەك بێت لـە هـەر شـەرائیتێکدا ببێـت ژیـانی تـازە مـەرگی دەوێـت, ئەگەر وابێت ئەو مرۆڤانانە وا گیانی خۆیان دەکەن بـە پێشـەنگ, وا بـەر لـە هـەموو کەسـێ دەمـرن , ئەوانـە مایـەیی (هۆکـاری) ژیـانی میللـەتن, ئەوانـە دەمـرن ئـەمجا میللەت زیندو دەبێتەوە، بۆیە لە ڕاستیدا مەرگی ئەوانـە سـەرەتای ژیـانی میللـەتن, ئەوانە نامرن، چونکە بەبۆنەی ئەوانە میللەت زیندوو دەبێتەوە.

******

❁ زۆرن ئەوانـەی ئـازار دەکێشـن، بـەڵام پاشـان شکسـت دەخـۆن، چـونکە پایـە دارییان نییە(اقامەت)، چونکە موقاوەمەتیان (بـەرەنگاری)کەمـە، تـەنها کوشـتەدان بەس نییە، تەنها زەجر و ئازار کێشان کافی نییە، گرنگ پایـەداری (خـۆڕاگری)ە لـە ڕێگەیەکی ڕاستەوە.

******

❁ ئازادی سفرەیەك نییە ڕاخرا بێت, بڵێن: جا قوربان فەرموون بخۆن...

******

❁ مەرجی گەورەی ئاگاهی ئەوەیە کە مرۆڤ هێزی باتنی(ناوەکی)زۆرتر بێت لەوەی وا زاهیری دەدات, مرۆڤ هەرچی هەیە نابێت بیرێژێتە مەیدان, نابێت تەواوی هێزی خۆی لە رۆژێکدا لەدەست بدات! موسولمانەکان ئاگاداری ئەوە بن شەهیدان پێویستە, بەلاّم مەتلوب ئەوە نییە هەر مرۆڤ بمرێت! شەهید دەبێت بیدەیت و بزانیت بۆچی, شەهیدی بۆ ئەوەیە ژیان بەدەست بهێنیت, دەبێت ئاگاتان لە خۆتان بێت ئەگەر بڕیار بێت هەر کوشتە بدەن لاواز دەبن.

******

❁ بەرنامەگەلێك یان مەکتەبگەلێك، کە هەوڵ دەدەن کێشەیەك لەکێشەکانی کۆمەڵگەی بەشەری چارەسەر بکەن بە ئیعتباری ڕەوشی کار و چالاکییان دەتوانین بیان کەینە دوو دەستەوە:

دەستەی یەکەم: شیعاری (شیعارگەرا)

دەستەی دووەم: عیلاجی(چارەسەری) ـ چارەسەرگەرا ـ

واتە دەستەیەکیان زیاتر پێداگرن لەسەر شیعاردان و عیبارات دروست کردنێك کەتوانای ئەوەی هەبێت سەرنجی خەڵکی ڕابکێشێت، بەلاّم سەتحی کاراییان و کاریگەرییان بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کۆمەڵگە لەخوارەوەی ئەو شیعار و بانگەشانەیە دەیکەن! ئەو دەستەکەی تر کە(چارەسەرین)، واتە لایەنی بانگەشە و دروشم مەترەح نییە بۆیان، کاریان زیاتر بریتییە لە چارەسەرکردنی کێشەی کۆمەڵگە بێئەوەی گرنگی بدەن بەلایەنی بانگەشەیی.

******

❁ (تسخیر)* بەدیلگرتن و کۆنترۆڵ کردنی جسم لەچاو بەدیل و کۆنترۆڵکردنی فکردا شتێکی بچوکە, ئینسانێك ببەیت و زیندانی بکەیت زۆر کەم زەرەرترە تاوەکو ئەوەی بێیت فکری بگۆڕیت و دیلی بکەیت. لە جاهیلییەتی دونیایی ئەم ڕۆژەدا وەك جاهیلییەتی درێژایی مێژوو (تسخیر) و دیلی فکر دەکەن کەئەوە بەدبەختییە, ئەو قوتابخانە بەشەری و یاسا و سیستەمە بەشەریانە زۆر زاڵمانەتر کاردەکەن لە چاو ئەو ئەشکەنجانەی لە زیندانەکاندا دەدرێن! چونکە (جسمی تسخیر) ناکەن{دەست بەسەر جسمیدا ناگرن}، بەڵکو (دەرونی تسخیر)دەکەن{دەست بەسەر دەروونیدا دەگرن}, جا دەرون گرنگترە تا جسم، هەرکە دەرون تسخیر کرا تازە ئیتر ئینسان نییە ! جسمیش شوێنکەوتەی دەرونە و بە قسەی دەرون و فکری دەکات.

*******

❁ دروستکردنی گۆڕانکاریی لە کۆمەڵگەدا، هەر ئەوەندەیە مەتڵەبێك بچێتە ناو کۆمەڵگەوە, هەروەك ئەوە وایە بەردێك بخەیتە ناو (ئاو)ەوە شەپۆل دروست دەکات و، مەوج دەداتەوە، لەکۆتایدا وردە وردە دەگاتە ئەوەی هەموو لایەك دەگرێتەوە و، کۆمەڵگەش موتەحەول دەبێت بەمەرجێك ئەم بەردە لەسەریەك لەسەریەك فڕێ بدەیت تا لە بنەماوە ئەو دەریا لە زەلکاو پڕ دەبێت و لادەچێت و هەمووی دەڕژێت بەملاو بەولادا ئەو فەرهەنگە پیسە هیچی نامێنێت.

*******

❁ هەمیشە لە کۆمەڵگەدا کە دەردەکان زۆر دەبن و کۆمەڵگە دەبێت بەیەك پارچە لە دەرد ئەو کاتە قورسترین کار ئەوەیە تۆ بێیت دەردێك دیاری بکەیت و قسەی

---

*) تسخیر: داگیرکاری، کار یان ڕەوتی داگرتن و دەستبەسەردا گرتن.

لەسەر بکەیت, چونکە دەردی بەشەر جۆراوجۆرە برێك دەرد هەیە(دایکەدەردانە), دەبێتە بناغە و ئەساسیات بۆ دەردو نەخۆشی دیکە,برێك دەرد هەن بچکۆلە بچکۆلەن, لق و پۆلن.

******

❁ ئەشرافییەت نیشانەی ئەوەیە لە ڕێگەگەلێ ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆوە دزی کراوە و خیانەت کریاگە لە ئەفرادی کۆمەڵگە! زۆرێك لە خانەوادەگەلی فەقیرکەوتون و مەزڵوم بوون، بێ زندەگی، بێ ماڵ و ڕووت، جا حقوقی ئەمانەش چووە لەولاوە وەك (قارچك) هەڵتۆقیاوە، بۆتە ماڵگەلی ئەشرافی! بووەتە زیندەگیگەلی ئەشرافی!

*******

❁ ئەوە بزانن کەسێك کە دەرکێ صەحیحی ئیسلامی هەبێت کاتێك زیندەگی ئەشرافی ببینێت قیزییەتەوە، چونکە دەزانێ ئەوە شوێنی خیانەتە، ئەوە شوێنی دزییە، ئەوە شوێن کلاو نانە سەرە، جا چی خودی ئەو شەخصە دەخاڵەتی تێدا هەبێت، چی دەخاڵەتێکی تێدا نەوێت و خەتای دەوڵەت بێت.

❁ هەرکەس دەڕوات تەماشای (بەیت) دەکات، تەماشای (مسجدی نبی) دەکات وەلا لە (کۆشك)دەچێت! !. بۆچی حەزرەتی ڕەسول الله(ﷺ) ئیجازەی ئەدا ماڵی موسوڵمانگەل ئاوا خەرج بکرێت و وەك (کۆشك) دروست بکرێ ؟ بۆچی تەواوی خەڵك دەیتوانی ماڵی بەو جۆرە هەبێت ئائێستا بێیت بەناو مزگەوت بەناو سەنتەری دینی ئەم شتە ئەشرافییە دروست بکریێ؟ ئائەمە یەکێك لە خیانەتگەل بوو کە (بەنی ئومەیە و بەنی عەباس)، یانی ( ئومەیەگول و عەباسیگەل) دەستیانپێکرد بۆ لەبەین بردنی خصوصیاتی فەرهەنگی ئیسلامی.

کاتێك مزگەوتە گەورەکان، سەنتەرە ئیسلامییە گەورەکان وورده وورده ڕەنگی فەرهەنگی ئیسلامی ون دەکەن و ڕەنگی ئەشرافی دەگرێن ئیتر ئاساییە خوێن تاڵ

نابیّ لەبەر چاوی خەڵکی {ئیتر ژیانی ئەشرافی خوێن تاڵ و نابووت دەرناکەوێت لەبەرچاوی موسوڵمانانەو، چونکە ئەوانە مزگەوت و سەنتەرە دینییەکانیان بەوشێوەیە ئەشرافی دروست کراوە !!}. کاتێك خەڵکی دەچنە(مسجد الحرام) دەچنە(مسجد النبی) ئەم گشتە زەرق و بەرقە ئەوێنن ئێژن(ماشا الله، اللهم مصلی علی محمد وعلی اله محمد). خوێن شیرین ئەوێت لە بەر چاویان!!

*******

❀ ئەگەر دین لە ئینسان وەربگریتەوە وەك ئەوە وایە غەریزە لەحەیوان وەربگریتەوە!

*******

❀ سەعادەت: بریتییە لەو (ئارامش و ئاسایشەی واهەموو کەس بەنیسبەتی ژیانی خۆی و ژنی و منالّی هەیەتی و هیچ نیگەرانی وخەمێکی نەبێت، سەعادەتێکی واقیعی واتە ئەوە.

*******

❀ هەموو خوێنەوارەکانن بوونەتە هۆکاری سەر لێ شێواندی خەڵك، بەتەنها خوێنەواری کار دروست نابێت و، کار جێبە جێ نابێت، وەختێك خوێنەوار بەکار دێت کە لەگەلّ ئیمان بێت، چەکێك بێت بە دەستی ئیمانەوە، بەدەستی خوا دۆستییەوە.

*******

❀ جار جار دەبیستم برێك لە بەهائییان یان لە جوانای مونحەریف، دەڵێن: قورئان کۆن بووە هی زەمانێکی تر بووە، پڕ بوو لە هەڵە، ئەرێ بۆ یەکێك لەو بەهائییە موتەقەلیبانە لەو جوانە خوێنەوارە موتەقەلیبانە نایەن بە من بڵێن با منیش بزانم قورئان هەڵەی تێدایە! وەڵاهی ئەگەر قورئان هەڵەی تێدا بێت کەلامی خوا نییەو نامەوێت فرەی ئەدەم، بەڵام ئاخر هەی هاوار منێك عومرێکە موتالەعەی قورئان

دەکەم و ئیستیفادەی لێدەکەم و شاگردی قورئانم من بۆ هەڵەیەکم لێ نەدۆزییەوە؟!

بەلاَم جەوانێکی نەزان و نەفام، جەوانێکی بەهائی ئەحمەقی بێ شعور، بۆ لە من شارەزاترە لە قورئان؟! بۆ ئەو دەزانێت قورئان هەڵەی تێدایەو من نازانم؟!!

*******

❁ ئەوانەی دەستکاری کتێبە ئاسمانییەکان دەکەن و دەیانگۆڕن ئەوانەن وا ئەهلی جاهوجەلالن و سودیان لەوەدا دەست دەکەوێت، سودیان لە گەوجی خەڵکدا هەیە، ئەوانەن کتێبە ئیلاهییەکان دەگۆڕن، خۆ خەڵکی هەژارو فەقیر دەسکاری کتێبەکان ناکات..

*******

❁ ئەگەر لە زەمانی حەزرەتی ئادەمیشدا بەشەرییەت ئەوەندە گەشەی ببوایە، کە ئەوە وا خوا دەینێرێ بۆیی هەمووی زەبت کات و ڕایگرێت و بیگەیەنێتە جیلەکانی دواتری، ئیتر خوا پێغەمبەرانی دیکەی نەدەنارد، خۆ پێغەمبەران بۆ سەرگەرمی نین، بۆ شەڕو کێشەو جەدەل کردن لەگەڵ کەسانی تردا نین، بەڵکو بۆ هیدایەتی خەڵکن، پێغەمبەران مامۆستان نەک مامۆستای فلاَنە دەرس و فلاَنە بەرنامە! مامۆستای زهن ڕۆشنکردنەوەن، مامۆستای چاکسازی و بابەتەکانی کۆمەڵگەن، مامۆستای ڕزگار کردنی خەڵك، مامۆستای ئەوانەن.

*******

❁ قورئان، بۆ ژیانی مەعنەوی ئینسان، وەك زەوییە بۆ ژیانی مادی ئینسان..

******

❁ بەرنامەی تەواوی پێغەمبەران: خەڵك لە شیرك ڕزگاریان ببێت و فێری تەوحید بن، واتە لە چەند خودا پەرستی ڕزگاریان ببێت و فێری ئەوە بن یەك خودا بپەرستن..

******

❀ بەرنامەی نەیاران لە قوتابخانەکاندا، یان بە شێوەیەکی گشتی فەرهەنگی داگیرکاری لەم سەرزەمینانەدا کە بە ئێمە دراوە کارێکی کردووە بەراستی ئێمە نیسبەت ڕابردوو و مێژووی خۆمان زۆر زانیاریمان نەماوە و نیمانە...!

❀ دیبانەتی شیرك بەروبومە، ضاهیرەکەی کە بەچاو ببینیت ئەوەیە، کۆمەڵێك ماقوڵ بن و کۆمەڵێك ناماقوڵ, ئائەمە ڕەمزی ضاهر(ڕوخسا)ی شیرکە! ئەمەش خەڵکی وردە وردە فێری دەبن.

******

❀ کابرا ماڵەکەی قورئانی تێدایە، کەچی خەریکە بەدەردی شیرك و بتپەرستییەوە دەتلێتەوە!!

******

❀ جەماعەتی مەلایان! ئومێدم هەیە لەم ساتەوە ڕێگەی قاتع و ڕۆشن بۆ خۆتان تەئمین بکەن, دەزانم شوکر بۆ خوا لەم ولآتەدا ئێوە ڕۆشناییەکتان خستۆتە ناو خەڵکەوە، ئێوە توانیوتانە کەمێك زیهنی خەڵکی ڕۆشن بکەنەوە، بەڵام ئەمە کەمە! ئەگەر کابرا نەخۆشییەکی ببێت دەرزییەکی لێدەدەن، بەڵام کاتێك کابرا خەریکە جەڵدە لێی دەدات, کابرا کۆڵەوارە و لەدەست و پێ کەوتووە, دەستوپێ(شعور و دەرك)ی کابرا لەم کاتەدا بەدەرزییەك ڕزگاری نابێت، بەڵکو دەبێت بەتەواوی وجودەوە هەوڵی بۆ بدەیت...

******

❀ لە دونیادا نەخۆشی و زەجر و حەسرەت و ئازار هەیە و لەدوای ئەمانیشەوە مردن، بەڵام ئەگەر ڕێگەی خودا بگریت هەرئەوکاتە یەکسەر بەرەو خۆشبەختی دەچیت, ئەمە لەلایەکەوە, لەلایەکی تریشەوە ئەوە واهەر ئەو هەیە لە دونیا و

ئاخرەتدا جا لەپاشاندا وریا دەبیتەوە و سەیردەکەیت باقی تر هەمووی پیسە و هەرئەو قودرەتی هەیە کە خودایە، ئەویش لێت ڕازی دەبێت..

******

❁ ڕۆح: ئەو مەجموعەیەیە کە مرۆڤی جیاکردۆتەوە لە باقی حەیوانات. ئەساسەن لە تەعبیری قورئانیشدا لە زۆر شوێندا ئێمە دەیبینین. واتە (لوب) واتە (ئەرزشی ئەساسی). ڕۆحی ئینسان واتە ئەو شتە وا (ئەرزشی ئەساسی)هەیە بۆ ئینسان. لە زۆر ئایاتی قورئاندا بە تەشریع و لوبی تەشریع دەفەرموێت (ڕۆح ). بە ئەرزشی گەورەی هەر شتێك دەگوترێت رۆح، بۆنمونە (گەرما) بۆ (ئاگر) ڕۆحە.

******

❁ ئینسان ئەرزشە واقیعیەکەی وجودە مادیەکەی نییە, ئینسان ئەرزشە واقیعیەکەی حەیاتەکەی نییە شتێکی ترە لەسەرو ئەمانەوە, غەیری مادەکەو غەیری حەیاتەکە شتێکی تر هەیە, کە ئەوە ئەرزشی ئینسانە, ئەوە پێی دەڵێن (ڕۆح).

******

❁ ئەو شتەی هەرگیز لەلای من جێگەی بایەخ نەبووە، نازناو و تانەو تەشەری جۆراو جۆری خەڵکی بووە. من نازناوی ڕابەری لە خۆم نانێمەوە، ڕازیش نیم پێی.

******

❁ زۆرێك لە بابەتەکانی دونیایی مرۆڤ بە جۆری فەلسەفە قابلی دەرکن بۆ ئێمە, نەك بەشێوەی ئازمایشگا (تاقیگە), بۆیە ئەگەر دەرکی فەلسەفی لە ئینسان بسەنیتەوە دەبێت هەمیشە ئازمایشگایەك بە کۆڵییەوە بێت و, دەبێت بەبێ‌تاقیگە لە هیچ شتێك حاڵی نەبێت.

❁ لەقیامەتدا ئەصڵە کە(تەغیرە) وجودی نییە, ئەگەر وا بێت وەچە خستنەوەش نییە, و غەریزەیەکیش کە واصتەیە لەنێوان نەسلێکدا بۆ نەسلی دوای خۆی ئەویش وجودی نییە, بۆیە دەزانن لەبەرامبەر پیاوەوە (ژن) لەم دونیای موتەغەیرەدا کە تەصەوری دەکەیت وجودی نییە, لەبەرامبەر (ژن)ەوە لەقیامەتدا پیاوێك بەم مەئمورییەت و خصوصییەتەوە لە دونیایی ئەمڕۆدا هەیە وجودی نییە.

******

❁ تۆمەتدان لە خەڵکی یەك زەڕە زەحمەتی دەوێت, ئەویش نەبوونی (ئیمان)ە !

******

❁ ئەگەر مرۆڤ زۆر بەرەو مەعنەوییەت بچێت و لایەنی رۆحانی خۆیی بەهێز بکات و، بگاتە ئەوەی کۆمەڵگە دوچاری زەرەر و زیان ببێت و ئەمَ هیچ بەلایەوە گرنگ نەبێت، لەکاتەدا کۆمەڵگە ئیفلیج دەبێت، بە پێچەوانەشەوە، ئەگەر مرۆڤ لایەنی مەعنەوییەتی فەرامۆشکرد و، تەنها هەوڵی بۆ مەسائیلی مادیی بوو، ئەوکاتە بەهەمان شێوە ئافاتێك تووشی کۆمەڵگە دەکات، وەك ئەو ئافاتەی کە لە هەموودونیادا نموونەی هەیە...

******

❁ لە ئیسلامدا بەرنامەی ژیان هەم بۆ پیاوە و هەم بۆ ژن، مزگەوت کە جێگەی وانە خوێندن و، جێگەی تەواوی مەسائیلی دیکەشە، هەم بۆ پیاوە و هەم بۆ ژن. ئەوەی ئیستا دەیبینین مەجلیسەکان تەنها بۆ پیاوانن ئەمە غەیری بەرنامەی پەروەردەی ئیسلامییە. بەڵام ئەمەی ئیستا لەبەر فەسادی کۆمەڵگەیە، کە دورکەوتۆتەوە لە بەرنامەی ئیسلام، بەر لە ئیسلام ئەو تێکەڵییە نەبوو، ئیسلام هات

ئەم حاڵەتەی دروستکرد، چونکە بەرنامەی ژیان دەبێت بۆ ژن و بۆ پیاو بێت. ژن و پیاو پێویستە یەکتری ببینن، دەی کاتێك بڕیارە ئەم دووانە یەکتر ببینن دەبێ بەرنامەیەك دابنرێت حاڵەتی هاوسەنگی دروست بکات...

******

❁

گەنجان دەتوانن لە بەرامبەر لەشکرەوە بووەستن، گەنجە دەتوانێت باری قورسی کۆمەڵگە هەڵگرێت، کاتێك گەنج خەریکی خۆشگوزەرانی بەە هەستی بەرپرسیارێتی نامێنێت، گەنجێك کاتێك خەیاڵی خەریك بکات بە قیافە و قەدو باڵای ژنەوە ئیتر شتێك بۆی مەترەح نییە بەناوی پارێزگاریکردن لە نیشتمان! گرنگترین شتێك کە دیفاعی لێ بکات ناموسە، دەی ئەو خۆیی ناموسی نەماوە، چونکە خیانەت لە ناموسی خەڵکی دەکات، دەی با خیانەت لە ناموسی بکرێت هیچ گرنگ نییە بۆیی...!

******

❁ یەکێك لە شکستەکانی کۆمەڵگە بێحیجابییە، بێحیجابی شمشێرێکە بەدەست دوژمنەوە بۆ لەناوبردنی کۆمەڵگە، ئەگەر برسیی بن، و خەریك بێت لە برسا بمرن، بەو شەرتەی هەست بە بەرپرسیارێتی بکەن، کۆمەڵگە هێشتا ناتوانێت زوڵم قبوڵ بکات، بەڵام ئەگەر لە گەورەترین رەفاه و خۆشیدا بێت ئەو کاتە خوێڕیی ترە و ناتوانێت پارێزگاری لە نامووسی خۆی و نەتەوەکەی بکات..!

******

❁ ئەگەر یەك کەس عەبایەکی هەبێت، مێزەرەیەکی هەبێت و بەوە خۆی جیا بکاتەوە لەخەڵك ئەمە گوناه و مەعصیيەتە، ئەمە(فەخر) فرۆشییە، تەنانەت یەك کەس لەقەبی هەبێت و پێی بڵێن(مەلا ـ سەید ـ حاجی ـ شێخ)و ئەم لەقەبە ماقوڵتری

دەكات لەخەڵك و شانازی پێوە دەكات، ئەمە گوناهە، ئەمانە گشتی باتڵە و ئیسلام دەبێت هەموو ئەمانە لەناو بەرێت. تەواوی مرۆڤەكان دەبێت یەك پلەیان هەبێت لەڕووی مادی و مەعنەوییەوە، بان و خوار نەمێنێت، ماقوڵو ناماقوڵ نەمێنێت، لەقەب و ئیمتیاز و عەلامەت و مەدالیا نەمێنێت. ئا بەوجۆرە بەموحكەمی خەریك بووین میللەتی كوردمان حاڵی دەكرد، بەڕاستی ئەم میللەتە دەیتوانی ببێتە ڕەهبەری ئینقلاب بۆ تەواوی ئێران، ئەگەر بەوجۆرە بچوایەتە پێشەوە.

******

❁ قورئان كۆمەڵگای دینی بەئێمە حاڵی دەكات كەبریتییە لەكۆمەڵگایەك بەبێ ئیمتیازات، بێ چینایەتی، بێ گەورەو بچوك، كۆمەڵگای بێ ئەداو ئەتوار، كۆمەڵگای بێ فیزو تەكەبور، بێ لەقەب و تایبەتمەندی.

******

❁ ئیسلام واتە قەدی درەختەكەو (شیعەو سوننە) لقەكانی ئەم درەختەن.

******

❁ ئیسلام، ناوێكە خواییە و(سوننەو شیعە) دروستكراوی خۆمانن‌و ئەگەر شانازییەك هەبێت لەناوی خوایە، نەك لە سوننە و شیعە.

******

❁ غەریزەكان ئەو كۆمەڵە هێزەن لەمرۆڤدا، كەمرۆڤ هاندەدات بۆ دابین كردنی ئەو شتانەی بۆ ژیان پێویستی پێیەتی و سودیان لێ وەردەگرێت، بۆنمونە: غەریزەی پارێزگاری لە خۆ﴿حب الحیاە﴾ یان غەریزەی خواردن و نۆشین، غەریزەی جنسی،و باقی غەریزە گەورەو بچوكەكانی تر.

******

❁ فیطرەت: واتە بوون و مەوجودییەتی هەرشتێك بەوجۆرەی كەهەیە. بوونێك كەبەتێكڕای ئەو شتە لەشتەكانی دیكە جیادەكاتەوە. هەموو تایبەتمەندێكانی

مەوجودێك بەیەكەوە فیطرەتی تایبەتی ئەو شتە پێكدەهێنن، بەشێوەیەك تێكڕای ئەو سیفەتانە مەوجودییەتو بوونی ئەو شتە پێكدەهێنن، بەشێوەیەك كەلەسەرجەمدا بەو تایبەتمەندیو پێناسانە مەوجودات لەیەك جیادەكرێنەوە. فیطرەتی هەرشتێك سیفاتو تایبەتمەندییە كەكەسێك لەشتەكانی دیكە جیادەكاتەوە.

******

❀ جێگیر بوونی(شاهەنشای ئەمەوی)و جیاوازی ئەوان بەگرتنی دەسەلاتی شورا و كۆكردنەوەی هێزی حوكمەت و دەولەتی دەسەلاتدار، یەكەم هۆكاری جیاوازی بوو. ئەم جیاوازی نا نەوەیە چەندەها سەدەیە موسولمانانی بەرداوەتە گیانی یەكتری، و برا بەدەستی برا، چ لە ئێران لەسەردەمی سەفەویدا و لەچ سەردەمی ستەمكارانی تر لە ئێران و چەندەها شوێنی تر كوشتاری بەكۆمەل ڕوویداوە،–جابۆیە– ئێستا سەرەی ئێمەیە ڕێڕەوی لادانی مێژوو ڕاستبكەینەوەو لەو جیاوازییە كە دوژمنایەتی دروستدەكات بەرەو یەك ڕیزی و برایەتی بگەڕێینەوە، ئەمەش گەورەترین پشكێری برایەتیە، كەلیمەیەكە كە ڕەمزی سەركەوتن بووە و(ئیمام) هەموو كاتێك جەختی لەسەر كردۆتەوە.

******

❀ ئەگەر خەلكی ئێران زۆربەیان ئەهلی شیعەن لە ولاتە ئیسلامیەكانی تردا ئەهلی شیعە ئەصلەن نین، و هەلسانی(شۆڕشی ئیسلامی ئێران) لەسەر پەیوەندی ئیسلامی موسولمانانی تردەبێت و بەپێدانی پشكی سەرەكی بوونی(مەزهەبی جەعفەری) لە ئێراندا موسولمانان لە ولاتانی تردا بەردەداتە گیانی یەكتری، دووبارە ئاگری دوژمنایەتی و براكوژی بۆ چەندەها سەدەی تر دادەگیرسێنێ.

******

❀ ئایین و ئایینزا لە یەكتری جیاوازن. ئایین بریتییە لەبنەڕەت و ئایینزا بریتییە لەلقەكان. ئێمەش لەبەرئەوە لە بنەڕەت دور كەوتوینەتەوە دەستمان بەلقەكانەوە

گرتــووه، لەئێســتادا ئێمــە ئــایینزایین نــەك ئایینی، دەبێت هەوڵبدەین ببینە ئایینی، نەك ئایینزایی، و ڕێگەکەشی تەنها ئەوەیە چەند کۆبونەوەیەك لە تاران بەناوی(شورا)وە هــەبێت، کــە لــەناو ئــەو کۆبونەوەیــەدا دانە بە دانەی کێشەو بابەتەکان لەوانە لەدەستوری ولآتــدا جێگــای بایــەخ پێــدانن و ئەوانــەش بابەتــە لاوەکییــەکانی نێــو کۆمــەڵگا دەگرێتــەوە لــە بارەیانــەوە بــاس و لێکۆڵینەوە بکرێت، پاشان ئەو ڕێگایەی لەگەڵ پێــوەرە بنەڕەتییەکانــدا دەگونجێــت هەڵبژێرێت و کۆمەڵگاشی لیّ ئاگــادار بکرێتــەوە، بەپێچــەوانەی ئەمیشــەوە شــتێکی ڕوونە، کە هەرگیز ناتوانین لەم لێکترازانە بەرەو یەکبون هەنگاو بنێین.

******

❁ موســتکبیرین و مــوترەفین، یــان نــاوە گشــتییەکەیان(مــلاء)، ئەمانــە بەدرێــژایی مێــژوو کارێکیــانکردووە لەڕێگــەی جــۆراو جــۆرەوە بــەفروفێڵی جیــاواز وردە وردە دەســکەوتی ڕەنــج و کۆششــی خــەڵکی بێتــە ژێــر دەســتیان، خــەڵکی بێزاربێــت و نارەحەت زیندەگی بکات، بەڵام ئەوان خۆشبگوزە رێنن

******

❁ بەخوای گەورە صادقانەو صــەمیمانە پێتــانبڵێم، ئیمــانی خــوا لــەدڵی کەســێکدا جێگەی نابێتەوە، تـــا لەو دڵەدا خۆشەویستی هەژاران نەبێت.

******

❁ پـــاو

ئەو دڵە وا بۆ هەژاران کولّ نەدا

زەحمەتە ئیمان تیا جیّ گرتبیّ

❁ پایەیی یەکەمی بزوتنەوەی دینی، بریتییەلە خۆشەویستی هەژاران.

******

❁ کڵۆڵ ئەو کەسەی بەناوی ڕابەری بزوتنەوەی دینییەوە کاردەکات و پێی ناخۆشە هەژاران ببینێت و خۆشحاڵە بەوەی کاربەدەستان ببینێت.

******

❁ پێغەمبەر و هەموو هاوەڵان لەوپەڕی دینداریدا بوون، بەڵام نابینی یەکێکیان لەقەبێکیان پێوەبێت. کێ بیستویەتی بەحەزرەتی(علی) بگوترێ: (سید علی)؟ یان بۆ حەزرەتی(عومەر و ئەبوبەکر و عوسمان) وشەی(حاجی یان مەلا) دابنرێت؟ مەگەر ئەوان(مەلا و حاجی) نەبوون؟

******

❁ هەندێك کەس بۆیە پێغەمبەرانیان تا پلەی خوا بەرزدەکەنەوە، لەبەرئەوەی بڵێن خۆمانجێنشینیانین و لەهەموو خەڵك لە بانترین.

******

❁ بەگیانەکەی گشتان، ئەو سەرمەشقەی لەسەرەتاوە دانراوەبۆمان پەیرەوی لێ بکەن{مەبەست ئەو سەرمەشقەیە پێغەمبەرو هاوەڵان دایاننـاوە و ئیمتیازاتیان نەبووە،و وەك مرۆڤێکی ئاسایی سەیری یەکتریانکردووە} . ئا ئەم میللەتە مەزلومە بەدبەختە ئازادی دەبێت لەوەی هەزاری وەك من بێت و لەبازاڕدا هاتوچۆ بکات و هیچ سەرسوڕ هێنەرنەبێت و وەك کەسێکی ئاسایی سەیری بکەن.

******

❁ لەئیسلامدا هەر ستەم لێکراوێك مل بۆ ستەمکار پان دەکات و ڕازییە بەستەمەکەی، لەستەم کارەکە نەفرین لێکراوترە.

❀ ئێستا لە ئێراندا وا دەڵێن، دەڵێن" لەهجەی کوردی" چەندێك ئەحمەقانەیە!! ئاخر قسە لە ڕووی حسابی زمان ناسییەوە بکرێت، جا بزانن زمانی فارسی ـ سەرفی نەزەر لەوەی چەنێك زمانی قەڵەم و عیلمە ـ مەوجودییەتی چیە بیخاتە ڕوو، زمانی کوردیش لە شاخەی گەورەی هەورامییەوە، کە لەهجەی جیاوازی هەیە(سۆرانی)، کە لەهجەی جیاوازی هەیە(کرمانجی)، کە لەهجەی جیاوازی هەیە، (لوڕی)، کە لەهجەی جیاوازی هەیە، گشتی بهێنێت و بەراوردی بکات بزانێت(فارسی)دەوڵەمەندە یان(کوردی)؟

******

❀ لەگەڵ ئەوەی لە هەندێك شتدا جیاوازین، کە نەتەوەبوون و زمانمانە، ئەگەر لە هەندێك شتدا یەك بین، وەك دینمانە، عەقیدەمانە، فیکرمانە، ئەوە دەبێتە مایەیی ئەوەی هەرچییەکمان هەیە تێکەڵ بێتەوە لەگەڵ یەکترداو هەمووومان سود لە یەکتری وەربگرین، بەڵام کاتێك ڕوشتی بەشەر گەشتۆتە ئەم شوێنە، ئیتر زەرەرە بۆ مرۆڤایەتی وەك ڕابردوو، وەك سەدەکانی پێشوو بۆ هەر هۆزێك(پێغەمبەرێك) بنێریت، لەبەرئەوە هەر یەك(پێغەمبەری ناردووە بۆ تەواوی مرۆڤایەتی، کە ئیتر ئەم بەشەرە بەم ئاگاییەوە وا هەیەتی بتوانێت کۆمەکی یەکتری بکات و یەکگرتوییەك کە شەئنی ڕیشەی واحیدە، لایەقە لە ڕووی ڕیشەی واحیدەوە پەیدا ببێت بۆ بەشەرییەت تەحەقوق بکات .

******

❀ ئابوری ئیسلام لەبەرامبەر هەڵگرتن و لابردن سودو قازانجی زۆر زۆر پێشکەوتووە، هەروەها سەرکەوتوو ترە لەسیستەمی ئابووری سۆسیالیستی، لەبەرئەوە ئیسلام لە سۆسیالیزم بێ منەتە(کاری پێ ناکات).

******

❀ کەسێك تەنها (زانستی فیقهـ) شارە زابێت بە ڕۆشنبیری ئیسلامی دانانرێت.

❁ تۆسـەیری ئینسـان بکـە، ئەگـەر لـەناو مەجلیسـێکدا (پـەنجا)نەفـەر ئینسـان زیندەگی بکەن، تەنها یەکێك لەو ئینسانانە لەمەزایایی نیعمـەتی ئـەو مەجلیسـە بـێ بەش بێت، تەنها یەك دانەیان، (چلونۆ) نەفەریان لەتەواوی ڕەفاه و خۆشـیدا بێـت و یەکێکان بێبـەش بێـت بـۆ ئینسـانێك کەشـەرەفی ئینسـانیەتی هـەبێت ئێـژێ "ئـەو نیعمەتگەلـە گشـتی نەگبەتـە, گشـتی نەجاسـەتە"، چـونکە (چـلونۆ) نەفـەر بـەر خورداره لێی، بەلأم دانەیەکیان لێی مەحرومە"!

******

❁ شارستانیەت لەڕوخساریدا پێشکەوتووە، بەلأم تەماشایی بەشەریەت بکە ڕۆژ بە ڕۆژ ڕەشتر دەبێت، هەرچی پێشکەوتن و ئیمکانیاتی زۆرتر دەبێت بەشەرییەت بـەو مەفهومە دروستە بیناسە ڕۆژڕەشتر و کلۆلتر و بەدبەخت تر دەبێت.

******

❁ کەیفی خۆیە، چ دوژمنی هەس دینی خوا
بەلأم پێم سەیرە بەم گ دۆسە، لەهەرلاوە چی ئەکا

تێدەگەن یانی چی؟ کەیفی خۆیەتی هەرچی دوژمنی هەیە بانگەشە دەکات دژی دینـی خوا، ئەوە گرنگ نییە! ئەوە واعەجیبە لە نەزەری مندا، کە دیـن چـۆن دەتوانێـت بـەم گشتە دۆستەوە بمێنێت؟! چونکە پەنا بەخوا دۆسـتگەلێك کـە هەیـەتی لـەم دونیایـەدا لەملیۆنەها دوژمن زیاتر زەرەر دەگەیەنێت بەدین و خیانەتی پێدەکات*.

❁ نیعمەتی (بەیان) لە قالبی شیعردا، لەو جۆرە نیعمەتانەی کـە خـودا داویـەتی بـە بەشەر نیعمەتی(بەیان)ە، خۆی نیعمەتە و جۆر گەلێکی هەس، کە جۆرێکیان (شـیعر)ە لەناو جۆرگەلی بەیانا ئەم جۆریانە تواناییەك فرە بانتری هەیە بۆ گەیاندنی

---

*) ئەودوو بەیتە شیعرە لە کتێبی (دیاریێ بۆ یارن)دا بلأوکراوەتەوە، شەرحی شیعرەکەش هی (کاك ئەحمەد) خۆیەتی!

مەبەستگەل، مەبەستی دوورودرێژ لە دەربڕینی کورتدا , ئەمە خەلاتێکە خوای گەورە پێشکەش بەشەری کردووە, نیعمەتی بەیان لە قالبی شیعردا...

******

❁ خوای گەورە دوودانە ئەمانەتی داوەتە دەس کەسێك کە عالمی دین بێت, یەکێك بەندەکانییەتی، یەکێك ( دین )ە, تۆ ئەم ئەمانەتە (واتە دین) ساق و بێدەسکاری بگەیەنە دەس ئەو ئەمانەتەی دیکە (واتە: خەلك), ئەوە بەندەکانی خوا, ئەوە بەرنامە, تێکەڵ و پێکەڵی مەکە پاك و تەمیز و صادقانە بیگەیەنە.

******

❁ بۆئەوەی بتوانیت لە کاتی باسێکی جدیدا چەند شتێك لە قالبی سۆعبەتداا بلێیت، دەبێت کەشێکی دۆستی و حالی بوون فەراهەم بێت، ئەگەر ڕۆح و حالی ئەوکەسە ئامادەنەبێت و ئەم باسانەی لەگەڵدابکەیت زۆر گوناهە {واتە سۆعبەتی لەگەڵدا بکەیت بەبێ ئامادەی ڕۆحی گوناهە ! } ، ئەمە دەستوری خوایە ﴿ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ﴾.

******

❁ توانایی بیرکردنەوەو هۆشداری لەمرۆڤدا فیطرییەو ڕیشەکەی بەبێ پەروەردەو فێرکردن لەمرۆڤدا هەیە (حاڵەتی گەشانەوەی نالێم، چونکە گەشانەوەی تەزکییە و فێرکردنی دەوێت، بەلام بناغەکەی بەبێ تەزکییە و فێرکردنە، ئەگەر بنەمای شتێك لەمرۆڤدا نەبێت گەشانەوەی بێ مانایە)، ئەم بەشەش چەند ئەرکێکی هەیە، هەربۆئەوەش دراوە بەمرۆڤ ئەرکەکانی ئەنجام بدات.

******

❁ هەرکات فیطرەتی غەریزەی چەواشەبوو شتانێك دەخوات کە هیچ گیانداریك نایخوات، کۆمەلێك سیفاتی بۆ دروست دەبێت لەهیچ ئاژەلێکدا نابینرێت و، کارگەلێك

ئەنجامدەدات هیچ گیاندارێك ئەنجامی نادات! فیطرەتی عەقڵ شێوا بەهەمان شێوە شایەت زۆر خراپتر زۆر گومڕاتر زۆر پوچتر دەبێت لە حیوان...

******

❁ ئومەت: واتە جۆرێك لە هەمبەستەگی لەنێوان تاکەکانی مرۆڤدا، کە حەرەکەتی تەکامولی چ لە ڕووی مادییەوە چ لە ڕووی مەعنەوییەوە بۆیەکتری فەراهەم بکەن و ئاسانی بکەن، کە ئەگەر ئەم جۆرە هەمبەستەگییە نەبێت و ئەو مرۆڤ گەلە ئاوا پێکەوە نەبن ئەو حەرەکەتە تەکامولییە دروست نابێت و دانامەزرێت. هەروەها لە ئومەتدا جگە لەوەی ئیرادە و مەیلی خۆیان بوونی هەیە، لەهەمانکاتدا لایەنێکی دیکەش بوونی هەیە کە بریتییەلە: حەرەکەتی تەکامولی ئینسان.

******

❁ تودە[*]: بۆ دروستکردنی شتی بێگیان بەکاردێت، لەڕاستیدا (تودە) بەواتای (کۆگا)، واتە کۆگایەك لە مەواد، (کە مەواد غەیری حەیوانیشە بێگیانیش دەگرێتەوە). بەداخەوە لە ئێستادا ئەم چەمکە بۆ مرۆڤیش بەکاردەهێنرێت، واتە مرۆڤ لە حەیوانیش خراپتر مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت، بۆیە (تودە) زۆر خراپترە لە پلەی (حەیوان) و هەمبەستەگی (حەیوان) زۆرترە لە هەمبەستەگی (تودە)، کە بەمانای بەش و پارچەکانی مەوادێك دێت، کاتێك دەڕژێت بەسەر یەکدا و تێکەڵی یەکتری دەبن، بەبێئیرادە و بەبێمەیلی بەرنامە دارشتنی خۆی دەخالەتێکی هەبێت بەیەکەوە دەبن و تێکەڵ دەبن.

---

[*]) تودە: یەکێکە لەو چەمکانەی لە زانستی کۆمەڵناسی و لقەکانی و زانستی سیاسەتدا بەکاردەهێنرێت، کە تا ئەو جێگەیە بەندە بەشوێنیدا گەڕابێت لە هیچ جێگەیەکدا نەم دۆزیوەتەوە، کە شەرحی ئەم چەمکە بەمشێوەیەی (کاك ئەحمەد) بکرێت و، ئەوە روونبکەنەوە کە (تودە) بە کۆمەڵبوون و تێکەڵبوونی شتە بێگیانەکانی وەك (کۆگایەك) بووترێت...

❁ ران ـ پۆل ـ ڕەوگ: ئەمانە بۆ کۆبوونەوەی ئاژەڵگەلێك بەکاردەهێنرێت، کە بەمەیلی خۆیان بەیەکەوەن، ئیرادەی خۆیان لە کۆبوونەوەیان بەیەکەوە بوونی هەیە، جا جیاوازی (تودە) لەگەڵ (ڕان)دا لەوەدایە، کە لە(تودە)دا بەهیچ شێوەیەك ئیرادە و مەیل و تەصمیمی خۆیان بوونی نییە، بەڵام لە (ران و پۆل)دا بوونی هەیە.

******

❁ بۆئەوەی بە کۆبوونەوە کۆمەڵێك بووترێت (ئومەت) دەبێت شتێك بانتر لە یەکەوە بوونی دروستکراوی بێگیان و گیاندار بوونی هەبێت، کەویش هەمبەستەگی و حەرەکەتی تەکامولییە لە ڕووی مادی و مەعنەوییەوە، بۆیە ناتوانیت بە کۆمەڵگەی ئەمەریکی و ئەوروپی بوترێت ئومەت، چونکە هەرچەندە لە ڕووی مادی و پیشەسازییەوە لە پێشەوەبن، بەڵام دەبینیت لە ڕووی مەعنەوی و کۆمەکی یەکتری کردن و خۆشەویستی و ئازارنەدانی یەکترییەوە لە دواوەن.

******

❁ بنەڕەتی دروستبوونی فیرقەگەری و جیاوازی دروست بوونە لە نێوان مرۆەکاندا بۆ ئەوکاتە دەگەڕێتەوە، کە مرۆڤ لە ڕووی فکری و عەمەلییەوە پێشکەوتن و هەندێك دەستیانکرد بە وەرگرتنی ئیمتیازیاتی مادی یان مەعنەوی یاخود هەردوکیان، چونکە کاتێك کەسێك دەیەوێت ئیمتیازێك بۆخۆی وەربگرێت هەموو کەسێك ناکەوێتە شوێنی، لەم کاتەدا دابەش دەبن بەسەر دوو یان چەند گروپێکدا، تەنانەت هۆکاری جیابوونەوەی سنوری جوگرافیای دەوڵەتانیش هەر ئەمەبووە.

---

❁ موستەکبرین (خۆبانتر گرتن لە مرۆڤی دیکە) کە بۆلایەنی مادی مرۆڤە و، (موسرفین)کە بۆلایەنی مەعنەوی مرۆڤ، ئەمانە نەیانتوانی بێن قورئان بهێنن و وەك

(تەورات و ئینجیل) دەستکاری بکەن، بوڵکو هاتن قورئانیان خستە تاقەوە و وتیان: کەس بۆی نییە دەستکاری بکات، کەواتە ئەصڵی بەرنامە و یاسا و دەستوریان لە موسوڵمانەکان گرتەوە، هاتن گرنتی جێبەجێکردنی قورئان، کە (شورایە) لەناوبرد.

******

❁ پێغەمبەران هاتن ئەدەبی تەبەقات و ئەشرافییەت لەناو برد، لە جێگەیدا گەورەترین ئەدەبیاتیان دامەزراند، ئەویش ئەدەبی ئەکسانی و وەك یەك ژیان، ئەدەبی نەبوونی ئیمتیازات و دانەخوڕیان بەسەر ئەوانی دیکەدا، ئەدەبی فەخر نەفرۆشتن و بە کەم نەزانینی خەڵك، دین کاری ئەوەیە ئەم ئەدەبانە دامەزرێنێت.

******

❁ هەر مەکتەبێکی فکری چۆن مرۆڤ دەناسێت بەوجۆرە بەرنامەی بۆ دادەنێت و ڕەفتاری لەگەڵدا دەکات: ئیسلام لەلایەکەوە مرۆڤ بە مەوجودێکی خاوەن (فەهم و تەشخیص) و لەلایەکی دیکەوە بە خاوەنی (ئیختار) دەناسێت نەك مەخلوقێکی ناتوانا، بەڵام بۆنمونە (مارکس) ئەو جۆرە تەصەوری نیسەت بە مرۆڤ هەیە، کە تەصەوری حەرەکەتێکی جەبری دەکات بۆ مێژوو مرۆڤیش لەناو ئەم حەرەکەتە جەبرییەدا بێدەستەڵات دەبینێت، وەك مەوجودێکی بێشعور و بێئیختار، ئالەبەرئەمەیە کە کاتێك کۆمەڵگە دەکەوێتە دەستی دەبێتە دەستەڵاتێکی دیکتاتۆر! ئەوە مرۆڤناسینەکەیەتی واداری دەکات بۆئەو جۆرە دەستەڵاتە، کە دەڵێت: کۆمەڵگە دەبێت بە دیکتاتۆرری و هێز بەڕێوەببرێت.

******

❁ مرۆڤ دەستەڵاتی هەیە بەسەر مێژووە، مێژوو کە مەفهومێکە زهنی و ڕابردووی کاتە، دەستەڵات دار نییە بەسەر مرۆڤەوە، ئەوە مرۆڤە دەستەڵاتی هەیە بەسەر

مێژووه، خۆیەتی مەسیر و جیهەتی خۆی دیاریدەکات، چ بەرەوپێشچوون بێت یان دواکەوتن.

******

❁ هەر کاتێك مەکتەبێك بتوانێت کۆمەڵگەیەك بەڕێوەبەرێت و جیاوازی و تەبعیزگەلی تێدا لەناوبەرێت، ئەگەر کەسێك بیبەوێت خەتی خۆی لەم مەکتەب و کۆمەڵگەیەدا کە بێیدەڵێن (ئومەت) و، {تاك و گروپەکانی ناوی} بانترین جۆری هەمبەستەگی و ئاگایانە و موئمینانەیان هەیە بەیەکەوە، ئەوە بێگومان خیانەت دەکات.

******

❁ هەر کەس و مەلایەك خەبەری لە لە کتاب و سوننەت نەبوو, خەبەری لە دەریای فەهم و فەلسەفە و مەعاریفی ئیسلامی نەبوو، ئەوە بەبێگومان مرۆڤێکە لەگەڵ فەهمی دینیدا ناسازێت.

******

❁ ئێمە کاتێك بەناوی ئیسلامەوە تەشکیلاتێك دادەمەزرێنین، دەی دەبێت تاکەکانی ناوئەم تەشکیلاتە سمبولی فیکر و پەروەردەی ئیسلامی بن، ئەوکاتە تەشکیلاتەکەمان دەبێتە ئیسلامی، ئەگەرنا ئەوە کارەکەمان دەبێتە حاڵەتی تەشکیلات پەرستی.

******

❁ ئازادی مرۆڤ لە دەروونیدایە، مرۆڤێك لە دەروونەوە ئازاد بوو تەواوی هێزەکانی دونیا یەکبگرن ناتوانن ئەسیری بکەن، خۆئەگەر مرۆڤێکیش لە دەروونەوە ئەسیر بوو تەواوی هێزەکانی دونیا یەکبگرن ناتوانن ئازادی بکەن و ئازادی پێبدەن.

-----------------------------------------------

❁ ئەوەی وا زیندانی دەکرێت، یان مەرەخەس دەکرێت لە زینداندا تەنها (جسم) ـ لاشە ـ یە، ئەو کەسەی وا جسمی زیندانی دەکرێت ئەگەر دەروونی ئازاد بێت هەموو ئەزیەت و ئازاری دونیای بدەیت، یان هەموو خۆشی و لەزەتی دونیایی بۆ ئامادەبکەیت و پێیبدەن ناتوانن ئیمان و ئیرادەی بگۆڕن، ئەگەر شتێکی بە حەق زانی (لە ترس یان لە تەماح)دا نالێت ناحەقە، ئەگەر شتێکیشی بە ناحەق زانی هیچ کاتێك (ترس و تەماح) وایلێناکات بڵێت: حەقە!

******

❁ لە مەسەلە مادیەکاندا دەبێت ئینسان تەماشای خوارتر بکات{واتە کەسانی خواری خۆی}، بۆ ئەوەی تەماحی نەبێت, بەلآم لە مەسائیلی مەعنەوی و ڕوبەڕوبوونەوە و ئەرزشگەلی کۆمەلآیەتیدا دەبێت هەمیشە تەماشای بەرزتر و گەورەتر بکات و سەیری بەرنامەی بەرزتر بکات، بۆئەوەی بەهیمەت تەکانبدات و ڕازی نەبێت بە شتی بچکۆلە.

******

❁ ئەمانەی ئێستا هەن و پێیان دەوترێت دانیشتمەندی ئیسلامی (بیریاری ئیسلامی) ئەوانە دانشمەند نین, دانشمەندی ئیسلامی زۆر زۆر کەمن, ڕەنگە هەر ژمارەیەك بلێم زۆرم وتبێت, دانشمەندی ئیسلامی کەسێکە لە چوارچێوەی مەزهەبێکدا بیرناکاتەوە, دەبێت بۆچونەکانی ئەوەندە ئازادبن بتوانێت لە چوارچێوەی مەزهەب بچێتە دەرەوە, بتوانێت موجتەهید بێت لە (کتاب و سوننەت)دا, زۆربەی بیریارانی ئێستای مەزهەبی (سوننە و شیعە) موجتەهیدی ناو مەزاهبن, واتە لە چوارچێوەی مەزهەبێکدا دەتوانن فکر بکەنەوە, ئەوانە پێیان ناوترێت بیریار! ئەمەش بەس نییە بۆ زیندوکردنەوەی دین و دروستکردنی وەحدەت.

******

❃ (حەد) لە کاتێکدا ئەنجام دەدرێت کە تاکەکانی کۆمەڵگە بە بەیعەتـەوە ئیسلامیان ناسیبێت و پەیمانیان دابێت و کۆمەڵگەیەکی سالم دروست بووبێت, جا ئـەو کاتـە هـەر کەسێك ویستی ئەم سالمی و پاکێتیەی کۆمەڵگـە بـەرەو فەسـادی بەرێتـەوە ئـەو کاتـە دەبێت لە بەرامبەریەوە بووەستیت و (حەد)ی بـۆ دابنێیـت! ئەمـەش کاتێـك حکومـەت دەتوانێت ئەنجامی بدات کە سەرەتا و پێش دروستبونی ئینقلاب و حکومەتی ئیسـلامی تاکەکانی ئەو کۆمەڵگەیە پەروەردە کرابن.

******

❃ ئینسانی مەکتەبی واتە بزانێت: موتـەعەهید بێت بە ئاوات و, ئامانج و ئـەخلاق و عەمـەل, بـە هەرچـی شـتی مەکتەبەکەیـەتی موتـەعەهیـد بێـت, بەواتایـەکی دیکـە, شارەزا و موتەعەهید بێت بە مەکتەبەکـەی خـۆی, کـە ئەساسـەن (موسـڵمان) واتـە ئەوە, بەڵام بە داخەوە لەبەر ئەوەی بە هەرچـی شـتە دەوێـژرێت(موسـڵمان) ئێسـتا مەجبور بوین وشەیەك زیادبکەین و بێژین (موسڵمانی مەکتەبی)، کە موسڵمان خـۆی بە واتای واقیعی دەبێت مەکتەبی بێت.

******

❃ ڕێگەی عیلمی و عەمەل پەیدابونەوەی (ئومەتی واحید) هـەر ئەوەیـە کـە (دینـە واحید)ەکە دروست بێتەوە.

******

❃ هێشتا موسڵمان دروست نەبووە! موتەعەهید نـەبوون بـە ئیسـلام! ئیسـلام لـە ئێستادا شتێکی سوننەتی و خانەوادەییە! کوا، کێ پـەیمانی بـە ئیسـلام داوە؟ کـێ بەیعەتی داوە (موو بە موو ) ئیسلام بەو شێوەی هەیە ناسراو بێت پێی؟ نییە, بۆیە حەقیقەتەن ئەمەی وا هەیە موسڵمان نییە, چونکە ئیسلام ئـەو بەیعەتـە ئاگاهانەیـە کە دەدرێت.

❁ بیریارێك دەتوانێت دین زیندو بكاتەوە و وەحدەت دروستبكات، كە موجتەهید بێت لە (دین)دا, و بگەڕێتەوە بۆ مەوازینی ئەصڵی كتاب و سوننەت.

******

❁ ئەگەر كەمێك دیقەت بكەین, هەر بەو جۆرەی كە كوفر لەسەرەتاوە دەبێتە هۆكاری جیاوازی (تەفرەقە) لە پاشانیشدا (تەفەروق)یش دەبێتە هۆی ئەوەی كوفر بە شوێنیدا بێتەوە, واتە هەم عیلەتن بۆ یەكتر, هەم مەعللولن, پەیوەنی ئیمان و وەحدەتیش بەو جۆرەیە, هەر كە ئیمان پەیدا بوو بە شێوەیەكی ئاسای وەحدەت پەیدا دەبێت, وەحدەتیش پەیدا بوو ئیمانەكە زیاتر قەوی دەبێت.

******

❁ كەسیفترین شێوازی شیرك ئەوەیە, كە كۆمەڵێك دێن (كۆمەڵەكەی خۆی بە حەق دەزانێت و بە دینی ئیلاهی دەزانێت و باقی (كۆمەڵەكانی)دیكە بە باطل دەزانێت! هۆكاری ئەمەش چییە, كە كە سێك یان كۆمەڵێك بێت و پەیڕەوی بكەن لە لقێك (بە ناو مەزهەب)ە و مەزهەبی خۆیان بە خاس بزانن, ئەمە چۆن دەبێت بە شرك؟؟!وەڵامی ئەم پرسیارەش بەستراوەتەوە بەوەوە كە دەبێت مانای ڕون و ئاشكرای شرك لە دیندا بزانین, كە ڕونترین خاسیەتی شیرك ئەوەیە لەبەرامبەر غەیری خواوە بابەتێكمان هەبێت. دەبێت لە بەرامبەر خواوە ڕەفتارم چۆن بێت, بێم ئەو ڕەفتارەش لە بەرانبەر غەیری خواوە ئەنجام بدەم.

******

❁ گەورەترین خەسڵەتگەلێك كە شیرك دیاری دەكات, لە یەك مانای فراوان و دروستدا كورتدەكاتەوە بریتیە لەوەی:

١. ئەوە وا سیفەتێكە دەبێت تەنها بۆ خوا بەكار بهێنرێت و ئەركێكە تەنها لە بەرامبەر خواوە هەمانە بێن بۆ غەیری خواش هەمان كار بكەین و پێی ڕازی بین.

٢. غەیری خوا, کە مەحدود و سنوردارە و زەعیفە, سیفەتێکی پێبدەین, کە تایبەتە بە خوای گەورە, بۆ نمونە (نەبونی خوا) لەبەر ئەوەی ئاگاهی کامڵی نییە بە وجود و تایبەتمەندیەکانی ئینسان, هەقی بەرنامە دانانی بۆ ئینسان نییە, هەقی بەرنامە دانان تەنها بۆ خودایە کە ئینسانی خەلق کردووە و دەزانێت چۆنە و چی دەوێت. ئێمە ئا ئەم سیفەتە (هەقی بەرنامە دانان) رازیبین بیدەین بە بەشەر.

******

❁ شیرك دوو جیهەتی هەیە:

١. ئینسان گەورە بکەیتەوە و لە سنوری (مەخلوقیەت) بیبەیتە سەرەوە و سیفاتی خالقی بدەیتێ.
٢. خوای گەورە بە نا توانا بزانیت و , سیفەتێك کە تایبەتە بە مەخلوق (وەك نەبونی عیلمی موحیط) بیدەیتە پاڵ خودا.

واتە لە قۆناغێکدا ئینسان دەبەیت بۆ لای خودا و لە قۆناغێکی تردا خودا دەهێنیت بۆ لای ئینسان.

******

❁ کاتێك ئینحرافێك دەبینین لە دینی خودا پەیدابووە و دین نەماوە و لق دروست بووە, بەرپرسیارێتی ڕووبەڕووی تەواوی موسڵمانگەلە، کە هەوڵبدەن ئەم ئینحرافە قەرەبوو بکرێتەوە و ئومەت بکەوێتە سەر ڕێگەی بەحسی دین, جا هەر کەس بە ئەندازەی زانین و دەرکی خۆی.

******

❁ ڕۆحی ئینسان جیهەت (ئاراستەی) پێویست نییە, تۆ بەرەو هەر جیهەتێك دا نیشتبێتیت ڕۆحت دەتوانێت چالاکی خۆی ئەنجام بدات. (فکرت) کە هاوبەشە لە نێو

(ڕۆح) و (دەرون)دا ئەو هێزە ناوەکیەی کە هەتە چالاکی خۆی ئەنجام دەدات و جیهەتی پێویست نییە, بەڵام خۆ جیسم (لاشە) پێویستی بە جیهەت هەیە, چونکە مادەیە, ئەوەش دەزانین لە کاتی نوێژکردندا (لاشە) هاوکاری دەکات لەگەڵ (دەرون)دا. (لاشە و دەرون) بە یەکەوەن, لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە لە بابەتی نوێژدا کە لاشە و دەرون بەیەکەوەن, ئەگەر چی دەرون (ڕۆح)ی ئینسان پێویستی بە جیهەت (لایەنێکی ئاراستە نییە) و خوای گەورە جیهەتێکی بۆ نییە, بەڵام لەبەر ئەوەی لاشە پێویستی بە جیهەتێك هەیە, بۆیە دەبینین هەر لە سەرەتاوە جیهەتێك بۆ نوێژ دیاری کراوە (کە ئەویش سەرەتا بیت المقدیس و ئێستا کەعبەی پیرۆزە). ئەمەش ئەصل و فەلسەفەی ڕووکردنە کەعبە (بەردە ڕەشەکەیە)یە*.

******

❀ ئیمان دوو دانەیە: ئیمانی صادقانە و موخلیصانە, ئەوە وا بە ڕاستی دەبێت پێیبلێیت ئیمان, ئەوەیە کە بەردەوام مەحکەم و مەحکەمتر دەبیت. (لە کاتی ڕودانی هەر ڕوداوێکدا جێگیرتر و مەحکەمتر دەبێت). ئیمانێکی دیکەش هەیە, کە سەر سەری و لەگەڵ بارو دۆخدا گەڕیانە, ئەمە هیچ نییە, ئەمە نابێت ببێت و دەبێت جیا بکرێتەوە, چونکە دەبێتە هۆکاری خراپبوون و نابوتی ئیمانە ڕاستەکەی موسڵمانان.

******

❀ سوننەت ( سوننەتی ڕەسوڵ ـ ﷺ ـ) بە ناونیشانی (موبەین) لە زەرووریاتە، بەبێ ئەوە ئیمکانی نییە ئێمە بە شتکەلێك بگەین، کە لەلایەن (تەبینییەکەی)

---

* )لە ڕاستیدا بابەتی (ڕونکردنەوەی بەردە ڕەشەکەی کەعبە) یەکێکە لە بابەتە گرنگ و هەستیار و پرسیاراویەکان. کە زۆر کەس گومانیان بۆ موسڵمانان دروست دەکرد, بۆچی ڕودەکرێتە بەردێکی ڕەش و سوجدەی بۆ دەبرێت, خۆ ئەویش هەر بەردە, جا یەکێك لە وەڵامی ئەم پرسیارە ئەوەیە کە (کاك احمد) _ڕحمەتی خوای لێبێت _ زۆر بە مەنتیقی وەڵامی داوەتەوە و {ونی کردووەتەوە بۆچی بۆچی و هۆی ئەوە چییە؟

سپێردراوە بە سوننەت و، بە ئیجتهاد و دەرکی خۆمان بگەینە حەق و حەقیقەت بدۆزینەوە، بەڵکو حەتمەن لەو شتگەلەدا وا تەبینی داوە بە سوننەت ئێمە پێویستمان بە سوننەت هەیە، بەڵام لەبەرئەوەی سوننەت گرنگی هەیە و، رۆڵی پێغەمبەر (ﷺ) گرنگی هەیە، بۆیە لەبەر گرنگییەکەی نابێت هەرشتێك بە ناوی سوننەتەوە گەشتە دەستمان قبوڵی بکەین، ئامە خۆی بێئەهمییەتکردنی سوننەتە... !

******

❁ فکر و عەقیدە پایە و مەبنایە، کاتێك عەقیدە و فکر تێکچوو لەوەودوا ئیتر تەواوی ژیان تێکدەچێت و خراپ دەبێت.

******

❁ رازی ئەبەدییەت و خلود و بۆ هەمیشە بەکارهێنانی قورئان و ئیسلام ئەمەیە: کە نەهاتووە وەك چۆن بۆ منداڵ دەرس دەووترێتەوە ئاوا هەموو جوزئیاتی بە تەواوەتی باس بکات، جگە لە یەکە یەکەیەك نەبێت، وەك حوکمی (تەیموم) و دەستنوێژ لەچوارچێوەی تایبەت و مەبەستی خۆیدا، باقی دیکەی بابەتەکان بە مەوازینی کوللی هاتووە و، بە شێوەیەك ووتوویەتی کە دەکرێتە ئەم شێوازە جیاوازە لەم ئایەت و لەو ئایەتدا... لەمانە سود وەردەگرێت و دەتوانێت بە تەناسوبی نیاز و پێویستی جیاواز حوکم هەڵبجێنرێت (بەمەرجێك موخلیصانە بێت!) بیربکاتەوە و بتوانێت ئەم مەوازین و میقیاسە کوللیە بۆ هەزاران پێشکەوتن و گۆڕانکارییەك کەلەم ژیانەدا دروستی بکات بەکاری بهێنێت و سودی لێوەربگرێت.

******

❁ ئیسلام: بریتییەلە سیستەمێك لەناو کۆمەڵگەدا، کە موبتەنی بێت لەسەر (کتاب و سوونەت و ئیجماع)، ئەگەر ئەمە نەبوو ئیتر ئیسلام نییە.

******

❀ لەبەرئەوەی روکنی سێیەمی (دین) کە (ئیجماع)ە، واتە هەڵێنجاندنی ئەحکام بەهۆی شوراوە و راگەیاندنی ئەمە بوونی نییە، بۆیە زەروورەت ئیقتزای ئەوەی کردووە بۆئەوەی لە ئەحکامی بابەتەکانی سەردەمی خۆمات تێبگەین شوێن بۆچوونی پەرشوبڵاو بکەوین، ئەگەر (ئیجماع) وجودی هەبوایە کوفرە و دەرچوونە لە ئیسلام بکەویتە شوێن ئەم مەزهەب و ئەو مەزهەب.

******

❀ تەشریع کاری خوای گەورەیە و پێغەمبەر(ﷺ) خۆی حەقی تەشریعی نییە، تەنها حەقی تەبینی هەیە، پاشان ئیجماع ـ کۆی بیریاران ـ حەقی تەشریعیان نییە، نەك بیرمەندانی ئیسلامی، بەڵکو تەواوی بیرمەندانی مێژووی مرۆڤایەتی کۆ ببنەوە حەقی ئەوەیان نییەمەسیر بۆ خەڵك دیاری بکەن و یاسا دابنێن، ئەمەش لەبەرئەوەی:

یەك: شوناسی کامڵ نییە، بێشوناس چۆن بەرنامە بۆ خەڵك دادەنێیت؟

دوو: بە شێوەیەکی ئاسایی تەرەفداری (لایەنگری) نیسبەت بە بارودۆخی خۆیان لە زیهنیاندا هەیە.

******

❀ هەمیشە (موسوڵمان نەبوون) بەمانیی (کافر بوون)و (مونافیق بوون) نایەت.

******

❀ تەکلیفی مووسوڵمانان ئەوەیە (لەکاتی پەیڕەویکردن لە مەزهەبیشدا) زانایان بجوڵێنن و وادارپانبکەن هەوڵبدەن بۆ دروستکردنی شورای ئیسلامی.

❀ ئەوەی لەلایەن خواوە هاتووە (دینی ئیسلام)ە نەك (مەزهەب)، تاشورای ئیسلامیش تەشکیل نەدرێت ناتوانین لە ڕێگەی (جیاکاری) مەزهەبییەوە بەرەو

ڕێگـــەی (وەحـــدەتی دیـــن) بگەڕێینـــەوە،
هەمووومان تەکلیفە لەسەرشانمان تاسنوری توانایی بۆ تەشکیلدانی ئەو شورایە هەوڵبدەین.

******

❁ موسوڵمانی مەکتەبی کەسێکە ئەم حەقیقەتە بە تەواوی وجود دەرك بکات، کە: ئیسلام تەنها ڕێگەی ئازادی و سەرفرازی ئینسانەو تەنها ڕێگەی ڕزگار کردنییەتی لە ستەم و زیلەت (استضعاف)ی مەعنەوی و مادی، هەروەها دەرکی ئەوە بکات، کە: ژێربینا و بنەما لە حەرەکەتی مەکتەبیدا بریتییەلە لە (عەقیدە).

******

❁ ئەی ئینسان! ئەگەر قازانجی خۆت و ئەوانی دیکەت دەوێت، ڕێگەی کەڵك وەرگرتن لە خەباتەکانی هەستی و لێهاتووەکانی خۆت لە خالقی خۆت و هەستی داوابکە، چونکە ئەوەی کە هەبووی لە بۆتۆ و تۆشی لە بۆ هەبوو دروستکردووە، ئەوە ڕێی و شوێنی گەورەی تۆ و گێڕانی کاروباری زەمین دەزانێت.

❁ ئەی مرۆڤ! ئەگەر بەڕێی خاوەنی هەستیدا بچیت هەموو شت بۆتۆیە و بە قازانجی تۆیە، ئەگەر سەرەڕۆی بکەیت و چاوەڕێی زانستای خۆت بیت، کە بتخاتە سەر ڕێ، هەموو شت دەبێتە هۆی زیانی تۆ، چونکە تۆ خۆتی کە خاوەنی زانستی خۆتیت و ئەوەت دروستکردووە، بەهیوای مەخلوقی خۆت ببێتە ڕابەر و ڕێنیشاندەری تۆ.

******

❁ ئەی ئینسان وریابە و ئینسانانەتر تێبفکرێ! بۆ تۆ بەدناوییە کە بەرەو ئەستێران هەڵفڕی و (بت) دروست بکەیت و هیوای دەستگیری (بتی) خۆت بیت.

******

❁ ئەی مرۆڤ! تۆ لەوە بانتریت، کە مەخلوقی فکر و دەستی تۆ بێتە خودای تۆ.

******

❀ بەگشتی قسە کردن دووانە: یەکێکیان قسەی(زمنە) و ئەوی دیکەیان قسەی (دڵ)ە.

******

❀ کاتێک (سەمەری ئیمان) لە قەلبدا لە ترۆپکدا بێت، دیارە کاریگەرییە دەرەکییەکەشی هەر لە ترۆپکدایە.

❀ کاتێك کەسێك بەناوی دین و هیدایەتی بەندەکانی خواوە قسە دەکات، ئیلزامەن ئەم مانا دەگەیەنێت، کە "من جێنشینی خۆشەویستگەلی خوام و قسەی ئەوان دەکەم".

******

❀ ئامان خۆتان مەخەڵەتێنن بەوەی بێژن: با ئێمەش وەکو (ئەحمەو) بین، چونکە خۆم دەزانم چەنێك باری خەجاڵەتیم قورسە، لەبەر نالایەقیم بۆ ئەم ڕێگەیە...!!

******

❀ کاتێك دڵ لە تاو دەردەکانی خەڵکی مەزڵووم دێتە جۆش، زمان دەهێنێتە قسە.

******

❀ هۆکاری تەواوی بەدبەختییەکانی زاهری و باتنی و، دونیای و قیامەتی و، تاك و کۆمەڵ بریتییە لە (بەغی) ـ ـ، (بغی)یش دوو بیانوی هەیە: استکبار و ئەتراف، کە هۆکاری ئەصلی دووەمیش هەر یەکەمە!

******

❀ کاری من ـ ئێمە ـ ئەوەیە لایەنی کەم فیرقەگەری و گروپ و مەزهەب دروستکردن بە شێوەیەکی تازە لە کارماندا پەیدانەبێت، بەیارمەتی خوای گەورە ئاسانە کارمان

دروستکردنی مەزهەب و گروپێك عەقیدەی سیاسی بۆ جیابوونەوە لە باقی موسوڵمانگەل و لەبەرامبەر موسوڵمانگەلەوە وەستان نییە، بەڵکو مەسیری ئێمە هەوڵە و تەلاشێکە بۆئەوەی کە کارێك بکەین وردەوردە ڕەنگەلی ئیمتیازاتی فیرقەگەلی لەناوبچێت و شتگەلێك کە مایەی جیاوازی دروستکردنە لەناو موسوڵماندا بیخەنە دەرەوە و بەو ڕێگەیەی کە قورئان پیشانی داوە وردەوردە ئەو جیاوازییانە لەناوبەرین و، لە بیرو بۆچوونەکان بکۆڵینەوە، تاوەکو هەر لەبەرەوە موسوڵمانان لە دابەشبوونەوە بگەڕێنەوە بۆ وەحدەت.

******

❁ مرۆڤ ئەگەر شت نەزانێت پرسیاریشی بۆ دروست نابێت، بەرپرسیارێتی بۆ دروست نابێت، بەڵام کاتێك شتی زانی ئیتر لەبەرامبەر زانینەکەیەوە بەرپرسیارێتی دەستپێدەکات، ئەمەش ئەگەر خۆی نەخەڵەتێنێت و نەخەڵەتێت.

******

❁ دیوارگەلی حیسی ئەو دیوارگەلەیە کە دەیبینیت و خانووی پێدروست دەکرێت، دیواری سیاسی ئەو مەرز و سنورانەیە جوگرافیای وڵاتانیان پێجیاکردۆتەوە، کە گەورەترین تەوهین(ئیهانە)یە بە بەشەرییەت و، وەك حەیوان دابەشکراوە و ناوچە ناوچە سنوردارکراوە !

❁ گیانداری یەك بوعدی (مادی)، تەنها بەحوکمی غەریزە زیندەگی دەکات، جا لە سادەترین حەشەراتەوە تا گەورەترین و دیارترینیان بەگشتی یەك جۆر زیندەگیان هەیە، هەرچەندە سەرو خوار و جیاوازی پلە لە دەرك و تێگەیشتنیاندا هەبێت، بەگشتی یەك جۆر زیندەگیان هەیە و باش و خراپیان نییە، بەڵام ئینسان چونکە دروستکراوێکی دوو بوعدییە(مادی و مەعنەوی) دەتوانێت هەزار و دەیان هەزار جۆر زیندەگی بکات: بۆنمونە ئێمە دوو ڕەنگمان هەیە (سور و سپی) لەم دوو ڕەنگە ئەوە

نییە تەنها بتوانیت رەنگی سێیەم دروست بکەیت، بەڵکو بەپێی چۆنییەتی تێکەڵکردنیان دەتوانیت هەزاران پلە لە کەم و زیادی لەم دوو رەنگە دروست بکەین، جا حاڵەتی دوو بووعدی بوونی ئینسان زۆر لەمە ئاڵۆزتر و ووردترە.

******

❁ ئەوانەی دەچن لە گۆشەیەکدا دادەنیشن (تەکییە و خانەقا) ئەوە ڕاکردنە لە بەرپرسیارێتی، بەوجۆرە ئەوەش دەڕوات دەست دەداتە بەرەڵایی ئەویش ڕاکردنە لە بەرپرسیارێتی، بەڵام بەوجۆرە.

******

❁ هەندێك لە مەلاگەل کاتێك قسە دەکەن بارە سەنگینەکەی بۆ خەڵك و بارە سوکەکەی بۆخۆیانە...

******

❁ من باشبم هەر دەمرم خراپبم هەردەمرم، بە نەخۆشی بێت دەمر بە کوشتنبێت هەر دەمرم، جا بۆیە بە ماڵ و گیانْ هەموو ئەوەی دەتوانم دەیبەخشم بۆئەوەی لە قیامەتدا هاوڕێی پێغەمبەر(ﷺ) ـ ئەبوبەرکر و عومەر و عوسمان و عەلی - و پیاوچاکانبم.

******

❁ هەرچی خەصڵەتی (مەنفی و موسبەت) - نێگەتیف و پۆزەتیف - ی مرۆڤ هەیە بەستراوەتە بە (تەوحید)ەوە. {ئەگەر} تەوحیدێکی دروست لە فەهم و عەزم و تەصمیمدا بوونی هەبوو ئەوا هەرچی خۆشبەختی دونیا و ئاخیرەت هەیە لە مرۆڤدا جەمە (کۆ)یە، {بە پێچەوانەشەوە} پەنا بەخوا ئەگەر تەوحیدێکی مانادار بەسەر فەهم و زهن و قەلبی مرۆڤدا حوکم نەکات صەد ساڵ و هەزار سڵیش تەمەنی دونیایی پێبدە وەك گەورەترین (دەوڵەمەنگەل و فەرمانڕەواگەل) هەر کلۆڵە و بەد بەختە.

❁ ئەگەر خەڵك ڕازی بێت کەسێك زیاتر لە باقی خەڵکی ئیمتیازاتی پێببەخشین ئەوە (بتە)ە, ئەوە تاغوتە.

******

❁ (ئازادی) مرۆڤ ئەوەتا لە دەرونیدا, مرۆڤێك لە دەرونیدا (ئازاد) بێت تەواوی تەواوی هێزەکانی دونیا یەکبگرن ناتوانن (ئەسیر)ی بکەن, خۆ ئەگەر مرۆڤێکیش لە دەرونیدا (ئەسیر) بوو تەواوی هێزەکانی دونیا یەکبگرن ناتوانن (ئازاد)ی بکەن و (ئازاد)ی پێببەخشن.

******

❁ ئەوەی وا زیندانی دەکرێت, یان مەرەخەس دەکرێت لە زیندان تەنها (جسمە)ـ لاشە یە. ئەو کەسەی وا جیسمی زیندانی دەکرێت ئەگەر دەرونی ئازاد بێت هەموو عەزیەت و ئازاری دونیای بدەن, یان هەموو خۆشی و لەزەتی دونیای بۆ ئامادە بکەن, ناتوانێت ئیمان و ئیرادەی بگۆڕێت, ئەگەر شتێکی بە حەق زانی( لە ترسدا یان لە تەماحدا) ناڵێت ناحەقە! شتێکیش بە ناحەقی زانی هیچکاتێك (ترس و تەماح) وایلێناکات کە بڵێت حەقە!

******

❁ دەرکی مەحدود و بچوکی مەزهەبی, لەگەڵ مەفهومی فراوان و قوڵی ئیسلامدا ئاسمان تا زەوی بەینیانە! جا ئیتر فەرق ناکات مەزهەبەکە (تەسەنون) یان (تەشەیوع) بێت.

******

❁ بۆ کارگەلی عەمەلی، بۆ چالاکیگەلی عەمەلی مرۆڤ تا برێك ڕاهێنان و ئامادەگی قەلبی نەبێت باش ناتوانێت کارێکی عەمەلی سادەش کە تۆزێك سەنگین بێت ئەنجام

بـدات، جـا چ بـەوەی بگەیتـە ئـەوە کـە بەرنامەیـەکی دەروونـی و قـەلبی بێـت، بۆئـەوەی ئـەو مـەوجوودە دوو پێیـە ببێتـە ئینسان! ئەوە لە کوێ و چالاکیگەلی بەدەنی لە کوێ؟!

******

❁ چی بلێیم لـە بـارەی ﴿ليلةالقـدر﴾ەوە؟! چـەس کـە ﴿خَيْـرٌ مِـنْ أَلْـفِ شَـهْرٍ﴾؟، تەواوی عومری بەشەر لەبەرچاوبگرە، لەو کاتەوە حەزرەتی (ئادەم و حەوا) ـ سلام الله عليهما ـ خـەلق بـوون، هـەر وەرە بـەرەو خـوار، قـەرنها و قـەرنها... گشـتی بـە عینوانی فەترەیەك لە حەیاتی بەشەر حسابی بکە، تا ئەو ساتەی وا نـووری قورئـان هاتە خوارەوە بۆ بەشەر ـ عاتفی نایلێم، مـەنتقی دەیلـێم ـ تـەواوی ئـەو ژیانـەی کـە بوویـە بەشـەر، گشـتی پـڕە لـە بەرەکـەت، پێغەمبـەران (علـيهم الصـلاه و الشـلام) پەیامبەری رەحمەت بوون، هاتوون بۆ خۆشبەختکردنی بەشەر، وەلێ هێشتا گشـتی حساب بکەیت و بیدەیتە یـەك و، یـەك نـووری لێ دروسـت بکـەیت و لەبەرامبـەر ئـەو نـوورەوە وا لـە (لیلـە القـدر)دا نـازڵ بـوو بـۆ قـەلبی موبـارەکی موحەمـەد(ﷺ)، تەقریبەن وەك (گلۆپ)ێکی بچکۆلە وایە ـ ناڵێم خۆرەتاوەـ لەبەرامبـەر (گلـۆپ)ێکـی زۆر زۆر پڕ نوورەوە!

******

❁ هەرچی بڵێیت هەر زوڵم دەکەیت، مەگـەر ئـەوەی خـوا دیـاریکردووە، کـە ئـەوە باشە و ئەوە خراپە، ئەرزشگەلی ئیلاهییەك کە پێغەمبەران (عليهم الصلات والسـلام) تەبلیغیانردووە بە بەشـەر کـە فلانەشـت موسـبەتە و فلانەشـت مەنفییـە وا جێگـەی گرتووە لەناو بەشەردا کە کابرا زۆر زۆر زاڵمیش بێت حەز دەکات خۆی عادڵ پیشان بدات، زۆر درۆزنیش بێت حـەزدەکات خـۆی راسـتوێژ پیشـان بـدات، اەجـیش بێـت، خائین و فێڵبازو مەردم خەڵەتێن و گرانفرۆشیش بێت حەزدەکات خۆی وەك ئینسانی

سالم پیشان بدات، ئەوە بۆ وایە؟! ئائەوە ئاساری کاری پێغەمبەرانە (علیهم الصلاه و السلام).

******

❁ ئەگەر تۆ هەرخۆت ببینیت و خەڵکی دیکە نەبینینت ناتوانیت باش و خراپ ببینیت و ناتوانیت دیاریی بکەیت، کەمێك دوور تەماشای خەڵك بکە، ئەمجار تێدەگەیت و باش بۆت دەردەکەوێت، هیچ کاتێك نە (شووی) باش نیشانەی خۆش بەختییە، نە (ژنی) باش، نە ماڵی خاس نیشانەی خۆشبەختییە، نە هەزار بڕوانامەی دکتۆرا و پرۆفسۆری بخەیتە سەریەك و پسپۆڕی جۆراوجۆر بخەیتە سەریەك عاملی خۆشبەختییە! چی تەصەوری بکەی لە نیعمەتگەلی دونیا گشتی نیعمەتی ئەرزشدارە لە زاتی خۆیدا، ئەگەر بکەوێتە دەست خەڵکی وەلێ هیچکامی خۆیی مایەیی خۆشبەختی نییە. خۆشبەختییەکەی خودی ئینسان بە خودی خۆیەتی، ئەگەر خودی خۆی خۆشبەخت بوو، یەکەم: هەندێك لەوانەی گەرك نییە. دووەم: هەرشتێکی ببێت دەزانێت و وا بەکاری دەهێنێت و سودی لێوەردەگریت، کە مایەی خێربێت بۆ خۆی، و گشتیشی دەبێت خێر.

******

❁ بەخوا قەسەم هەر ڕۆژێك شایەك لە شاگەلی عالەم و سەرۆك کۆمارێك لە سەرۆك کۆمارگەلی عالەم بۆ ژەمێك دەعوەتم بکەنە بان سفرەی خۆیان ئەوەندەی ئەو سفرە وا لە رەمەزاندا بۆ ئینسان دادەخرێت ئەرزشی نییە... ئەم مانگە ئیتر خوا دەعوەتت دەکات ئێژێت: وەرەوە سفرەیەکم داخستووە بۆتان ئینسان، ئەمڕا، سفرەی کەم خواردن، سفرەی لەززەت نەبردن، سفرەی جسم نا، سفرەی دڵ و دەروون...

❁ فەلسەفەی ژیان دوو بنەمای هەیە، کە بریتین لە (جەلبی نەفع و دەفعی زەرەر). کاتێك ژیانی تاك و کۆمەڵگە بە تەندروست دەڕوات بەڕێوە گرنگە بەردەوام: جەلبی نەفع بکرێت و لە هەر شوێنێکدا زەرە پێشهات ڕێگری لێ بکرێت، بەڵام لە زەمانێکدا نەخۆشییەك لە ناوکۆمەڵگە و حوکمەتدا بڵاو دەبێتەوە ئیتر نەزانانەیە جەلبی نەفع بکەیت، بەڵکو دەبێت بێیت و دەست بکەیت بە دەفعی زەرەر، بۆئەمەش ئەم نمونە واقیعییە دەهێنمەوە: لەسەر هەر باوکێك پێویستە بۆئەوەی پەروەردەیەکی دروستی ڕۆڵەکەی بکات دەبێت جەلبی نەفع ز دەفعی زەرەر بکات، بەڵام کاتێك ڕۆڵەکەی تووشی نەخۆشی دەبێت ئیتر لەوکاتەدا فێرکردن و پەروەردەکردنی (جەلبی نەفعن) دەوەستێت، دەبێت بۆئەوەی ڕۆڵەکەی لەبین نەڕوات چارەسەری نەخۆشییەکەی بکات و دەفعی زەرەر بکات*.

******

❁ هەروەك چۆن منداڵ دادەنێیت و حاڵی دەکەیت، ئاوا چەندین جار سەرانی حوکمەتم داناوە و حاڵیمکردوون دین شتێکە و مەزهەب شتێکی دیکە! مەزهەب لە خوا و لە حەزرەتەوە (ﷺ) نییە، مەزهەب لەلایەن خوداوە نەهاتووە، دین لەلایەن خوداوە هاتووە. مەزهەب: بریتییە لەو بەرداشت و هەڵێنجاندنەی کە مرۆڤەکان لە کتاب و سوننەت و ئیجماعەوە وەریانگرتووە، بەڵام هەر حاڵی نەبوون!

---

* ) ئەم وتەیە هەڵێنجراوە لەو قسانەی (کاك ئەحمەد)، کە لە دەستپێکی (گۆنگرەی دووەمی شورای شەمس) لە کرماشان دەیانکات. لەوێدا دەیەوێت وەڵامی ئەو پرسیارە بجاتەوە کە ڕووبەڕووی کراوەتەوە، کە چۆنە ئەوەندە باسی وەحدەت دەکەیت، کەچی وا ئێستا شورایەکت جیاکردۆتەوە و کاردەکەیت؟ دەڵێت: ئێستا کاتی ئەوەیە (دەفعی زەرەر) بکەین...

❁ مرۆڤی موسوڵمان دەبێت تەواوی کارەکانی لە فەرددترین کارەوە تا کۆمەڵایەتی ترین کاری بۆئەوەی دروست ئەنجامیان بدات دەبێت لە سەرچاوەی دین (کتاب و سوننەت و ئیجکماع)ەوە وەریبگرێت.

******

❁ دووشت هەیە ژیان تەڵخ و ناخۆش دەکات، یەکێکیان پەیوەندی بە ڕابردووەوە هەیە و ئەوی دیکەیان پەیوەندی بە ئایندەوە هەیە، کە (خَوْفٌ)* و (حُزَن)ە. خَوْفٌ: (پەیوەندی بە ئایندەوە هەیە)، حُزَن (پەیوەندی بە ڕابردووەوە هەیە).

******

❁ کاتێك ئینسانی موسوڵمان لە ڕابردوویدا مەعصییەتی نەبێت و نافەرمانی دەستووری پەروەدگاری نەکردبێت، پەردەی تەوەهوم بەرچاوی ناگرێت و دەزانێت خوای گەورە خۆشی دەوێت، کاتێکیش خوا خۆشی دەوێت ئیتر چی گرنگییەکی هەیە ئەوانی دیکە خۆشیان بوێت یان نا؟! ئەوانی دیکە کێن؟ مرۆڤەکانن. لەکوێ؟ لە کورەی زەمیندا. با چوار ملیارد مرۆڤ لە کورەی زەمیندا دوژمنی ئەوبن، حەتا کورەی زەمینیش هیچ با کۆمەڵەی خۆر هەمووی دەژمنی ئەو بن، دەی چییە؟ کۆمەڵەی خۆر لەبەرامبەر ئەم دەستگا گەورەیەی دروستکەرەوە هیچ نییە! گریمان تەواوی کۆمەڵەی خۆر پڕبێت لە هێز و هەمووی حوکمەتی مرۆڤ بکەن، کاتێك خاوەنی هەستی (پەروەردگار) دۆستی منە ئیتر چی نیگەرانییەکم هەیە؟! ئەو هێزانە چی گرنگییەکیان هەیە بۆمن؟!!

******

❁ ئیمان کەم و زیاد دەکات و لە (ئایاتی قورئان و فەرمودەی پێغەمبەریشدا(ﷺ)باسکراوە)... ئەمەش لەبەرئەوەیە ئیمان دوو ڕووکنی هەیە:

---

* ) {قُلْنَا اهْبِطُواْ مِنْهَا جَمِيعاً فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَن تَبِعَ هُدَايَ فَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ} البقرة٣٨. لە قورئانی پیرۆزدا لە نزیکەی (٣٠)ئایەتدا لە سورەتی جیاجیادا ووشەی خەوف و حوزن هاتووە...

یەکەم: دەرك و مەعریفەتی حەقائیقی هەستی،{واتە: ناسین و مەعریفەت و دەرکی مرۆڤ دەربارەی ئەم جیهانە و خالقەکەی} . دووەم: سنووری قبوڵکردنی ئەم حەقیقەتە، ئەگەر زیاد و کەم لە رووکنی یەکەمدا ڕوونەدا(کە هەتا لەویشدا ڕوودەدات)، ئەوا بێگومان لە ڕووکنی دووەماد ڕوودەدات.

******

❁ چۆن دەبێت چاوەڕێیمان لە کەسێك هەبێت کە وا تەصەرو دەکات ژیان هەر ئەم چوار رۆژەیە، ڕووداوەکانی ئەم چوار رۆژەش هیچ نین، {چۆن دەبێت چاوەڕێی ئەو بین} ئەو شتانەی کە ئەم ژیانی چوار رۆژەی بشێوێنێت و لەتمە لەبوونی مادی ئەو بدات نەسیترسێنێت؟ ئاوا چاوەڕێکردنێك هەڵەیە! مرۆڤێك کە ئیمانی دینی نییە و بڕوای بە خوا و ئاخیرەت نییە، و وا تەصەور دەکات ئەم جیهانە بەڕێکەوت و بەبێنەزم و ئیرادە و شعور دروست بووە، مرۆڤ دەژی و دەروات و دەمرێت و تەواو دەبێت، حەقی سروشتی ئەم جۆرە مرۆڤە ئەمەیە کە کاردانەوەی دەروونی ترسنۆکی بێت و ئازا نەبێت..!

******

❁ ئێمە مرۆڤگەلێکمان هەیە، کە ئیمانی دینیان نییە و ئازان، ئەمانە ئەو خو و خەصڵەتەی هەیانە لە فکریانەوە وەریان نەگرتووە، ئەوە بیرکردنەوەکانیان نییە ئەم خەصڵەیتەی پێداون، بۆنمونە (خۆش ئەخلاقن، میهرەبانن، بەسەخاوەنت، ئازان...) ئەوە فکر و بیرکردنەوەیان نییە ئەمانەی وا دروستکردوە، نەخێر، بیرکردنەوەیان لەلایەکەو خەصڵەتەکانیان لەلایەکی دیکە! خەصڵەتەکانیان لەئەنجامی پەروەردە و بارودۆخی کۆمەڵایەتی و خانەوادەی و جۆرەها هۆکار کە کاریگەری دادەنێت لەسەر دەروونی مرۆڤ دروست بووە و سەرچاوەی گرتووە...

ئەگەر ئەمە نەبێت ئەوا حەتمەن دەبێت ئەو مرۆڤەی ئیمانی بە وا و ئاخیرەت نییە مرۆڤێکی ترسنۆك بێت!

******

❀ ژیان چییە؟ ژیان بریتییە لە لەحزەکان! هەناسەیەك دەدەیت و میقدارێك تێدەپەڕێت.. ژیان ئەوەیە لە نێوان ئەو دوو هەناسەیەدا، یەکێکیان رۆشتووە و ئەوی دیکەیان دێت (یان نایەت)..!

******

❀ سەیربکە مرۆڤەکان لە ڕابردوودا هاتن و ژیان و مردن و بوونەوە بە (خاك)، تەماشا بکە مرۆڤەکانی ئایندەش هەمان ئەو خاکەن، کە هێشتا لەدایك نەبوون: ﴿مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَى﴾ {طه٥٥}... ئەوانەی ڕابردوو ئەو خاکەن لە ژێرپێماندان، ئەوانەی ئایندەش هەر ئەو خاکەن لە ژێرپێماندان و تا ئێستا شێوازی مرۆڤیان وەرنەگرتووە و نەهاتوونەتە بوون! مرۆڤەکانی ئەمرۆش ئەوەتان لەنێوان دوو خاکدا {ئێستا ئێمە لە نێوان دووخاکدا وەستاوین، خاکێك اە ڕابردوودا و خاکێك لە ئایندەدا}.

******

❀ دین جۆرێك ئینسان دەناسێت و لەسەر ئەساسی ئەو ناسینەی، کە بۆ ئینسان هەیەتی و هاوتەریبن لەگەڵیدا بەرنامە بۆ گۆڕین و وەچەرخاندنی دادەڕێژێت.

******

❀ مەکتەب ژێربینایی کار دەکات و کارێك دەکات فکری ئینسان بگۆڕێت(وەچەرخێنێت),جاهیلیەت لە ئەفکار و ئەخلاق و ئەعمال و پەیوەندیەکانیان دوربخاتەوە، بەڵام لە حەرەکەتی ڕوبینادا تاکەکان هەر ئەوەن کە هەن، هەوڵدەدەین(بیریاران) شورایەك دروست بکرێت و چارەسەری بابەتەکان بکرێت.

❁ مەلایانی دین فرۆش! ئەوە گۆشت و خواردن نییە, کە بە دین فرۆشتن دەیکڕیت و دەیخۆیت, ئەوە ئاگرە, ئاگر دەکڕیت و دەیخۆیت!

******

❁ زانایان و ملایان و پیاوانی دین! بـڕۆن کرێکـاری بکـەن, هـەر کارێکـت پێخۆشـە بیکە. لەبرسا بمرن هەزارانجار زیاتر بۆت بەسودترە تاوەکو بێیت و فێڵبکەیت و دین فرۆشی بکەیت!

******

❁ بە ئومێدی خوا تاوەکو ئیمانم بە خودا و ئاخیرەت هەبێت .کاری خۆم دەکـەم و رێگەی خودا بەرنادەم بۆ ئەربابی دونیا.

******

❁ دیقـەت بکـەن چـەندەها نەسـڵ لـە حـەزرەتی (ئـادەم)ەوە تـاوەکو ئـەمڕۆ تـا قیامـەتیش هـاتون و ڕۆشـتون, دێـن و دەچـن. کـام پەیوەندیـە لـەم پەیوەندیانـەی ئینســان و تــەعلوقاتی دونیــایی ماوەتــەوە و دەمێنێتــەوە؟ بیرکەینــەوە ئــەو (کاتژمێرەی لە دەستدایە), جلێـك کـە لەبەرتایـە, ئۆتۆمبێلێـك کـە سـواری دەبێـت، فەرشێك کە لەسەری دادەنیشیت، پیاڵەیەك کە چای تێدا دەخۆیتـەوە, تـا دەگاتـە ئەو خانوەی کە تێیدا نیشتەجێیت. کـام لـەم پەیوەندیانـەی کـە لـەنێوان تـۆ و ئـەو شتانەدا هەیە دەمێنێتەوە؟

دیقەت بکەن حەتمەن دابرانێك دروست دەبێت، حەتمەن فیراق درەست دەبێت!

ئەویش لە یەکێك لەم دوو شێوەیەدا:

١. یان ئەو شتانە لە بەرچـاومان دەڕۆن، خـانووە خـراپ دەبێـت,فەرشـە دەڕێـت و, کاتژمێرە دەوەستێت... ئەوە ئێمەین دەیانبینین و هێشتا زیندون و ئەوان دەڕۆن.

٢. یان بە پێچەوانەوە, ئەوان دەمێننەوە و ئێمە دەمرین!

❀ دوو جۆر ترسمان هەیە :

لە زمانی عەرەبیدا دوو وشە لە بەرامبەر ترسەوە هەیە (جوبن, خَوْفٌ). کە بۆ دوو جۆر ترسی جیاواز لە یەکن.

خَوْفٌ: وشەی دیکەش هەر ئەم مانایە دەدات ,وەك (خەشیەت,تقوا) کە ئەمانیش جیاوازن لە یەکتری, بەلاّم بە گشتی یەك جۆرن جیاوازیشیان هەیە پێکەوە.

جوبن: ئەمە واتە (ترسنۆکی) .

جیاوازی نێوان ئەم دوو کاردانەوە دەروونییە (خَوْفٌ, جوبن), لەبەر ئەمەیە کە (جوبن) کاردانەوەیەکی دەرونییە غەیری موبتەنییە لەسەر واقیعات و حەقائیق. پشتی بەستوە بە گومان و تەوەهووم! لە ئەنجامی دروست حالّی نەبوونەوەیە, بەلاّم (خَوْفٌ) جۆرێك کارداەوەی دەروونییە کە واقیعیەتێکی هەیە, واقیعیەت کاریگەری هەیە لەسەر ئەم کاردانەوە دەروونیە, بەلاّم ئەمیش لە دوو پلەدایە, لە ئیسلامدا (جوبن) حەرامە، بەلاّم (خَوْفٌ) هەمیشە حەرام نییە, بۆیە دوو پلەی هەیە :

شێوازی نامەطلوب (خەوفی نامطلوب), ئەمیش پلەی جیاوازی هەیە, مرۆڤ دەرونێکی زۆر ناڕوون و غەیری قابیلی ناسینی هەیە, بەلاّم دەتوانین هەندێك لە دەرونی ئینسان باس بکەین, (جوبن, خَوْفٌ) لە دەرونی ئینساندا چۆن دروست دەبن.

دەروونی ئینسان بەشێکی بریتیە لە (تەحلیکر دن و ناسینەوە و تەصوراتی دەربارەی جیهان) جا دروست بێت یان نا دروست. یەك بەشی بریتیە لە (انفعالات) کاردانەوە، جا دەبێت ئەم دووانەیان بە یەکەوە پەیوەندیان هەبێت (تەصوراتی بۆ جیهان و کاردانەوەکانی). چۆن تێدەگات و تەصەوری بابەتەکانی جیهانی هەستی دەکات، ئەمە کاریگەری هەیە لەسەر کاردانەوە دەروونیەکانی. جۆرێك لە ترس

هەیە, کە ترسێکی نا مەعقول و نا دروست و نا واقیعی و حەقیقیە, کە ترسی بێ ئیمانی!

دوو جۆر ترسی دیکەمان هەیە کە واقیعیەتیان هەیە لە دوو سەتحی جیاوزدا، کە: یەکیان ترسی ئینسانە بە ئیمانەکانە, بەلاّم (ئیمانی زەعیف)! ئیمانیان هەیە، بەلاّم ئیمانیان بەهێز نییە!

ترسی دووەم, ترس مرۆڤ گەلێکە کە بە ئیمانن, ئیمانیان قەوییە, بەلاّم جۆرێك ئاشوفتەی و پشێوی و تێکەڵیان هەیە دەربارەی بابەتەکان.

بەگشتی (ترس) لەم سێ دەستەیە پێکدێت: ترسی یەکەم دەبێت لە کەسانێکەوە دەربکەوێت کە بڕوایان بە ئصولی ئیمانی ئیسلام نەبێت، ئەمانە ئەو کەسانەن کە ئیمانیان بە خوا و بە رۆژی دوای نییە، ئەم ئینسانانە مەوجودگەلێکن لە دەروونی خۆیاندا سەرگەردان و بێبەرنامە و بێئامانج و جیهەت و مەصیر و مەبەست وەستاون، بە بێبەرپرسیارێتی، جا ئاسایشە کە دەبێت ئەم جۆرە ئینسانانە بترسن، دەبێت (جوبن)نیان هەبێت (ترسنۆك)بن، چونکە ئەمانە جگە لەو بوونە مادییەی خۆیان، جگە لە دەورانی تێپەڕاندنی ژیان هیچی دیکەیان نییە! دووانەکەی دیکە لە وشەی (خَوْفٌ) جیادەبنەوە، کە یەکێکیان (ترسی نامطلوب)ە و ئەوی دیکەیان (ترسی مطلوب)ە، ئەمیش ئەوەیە کە بیرلە رابردوومان دەکەینەوە نیگەرانین کە خوا ئێمەی خۆش دەوێت یان نا.

******

❁ مذهب: لە وشەی (ذهب–یذهب)ە, (ذهب) واتە (رۆی), (مذهب): واتە ڕێگەیەك کە زیهنی بۆ دەچێت, مەزهەبی فلاّنە کەس, واتە ئەوە ناکە حەتمەن وایە, نەخێر، واتە: من زیهنم وای بۆدەچێت. (مەزهەبی شافعی) واتە: ئەو شتە کە (شافعی) و جەماعەی دانشمەندانی موجتەهیدینی پەیڕەوی (شافعی)زهنیان بۆی چووە.

❁ ئەگەر بێت و ڕیگەمان ڕۆشن نەبێت و ئیحتتیاتی پێویست نەکەین, بەڕاستی دەرەنجامی کارەکەمان دەبێتە ئەوەی, کە فیرقەیەکی ترمان, کە ئەم گشتە بەلآم و تەفەروقە بەسەریدا هاتووە جیامانکردۆتەوە و کردومانەتە یەك دانە مەزهەب, هەروەك چۆن ژمارەیەك لە موجتەهیدینی زاناگەل هەوڵیاندەدا لەبەر خاتری ئەوەی (مەزهەب) لەناو بەرن کەچی بۆچوونی خۆیان دەبووە مەزهەبییەت. ئێمەش ئەگەر هەوڵنەدەین هەر ئەوە دەکەین و فیرقەیەکی دیکە جیا دەبنەوە لە باقی موسڵمانگەل, ئەمەش جگە لە بەد بەختی بۆ ئوممەت هیچ دەرەنجامێکی نابێت.

******

❁ ئەگەر لەکاتی ژیانی خۆمدا بێت چاودێری دەکەم... بەلآم نیگەرانی ئەوەم هەیە دوای ژیانی من ئەفرادێك بیانەوێت و شك بکەونە ئەم بیروبۆچونانە وەها بکەن دەرەنجامی ببێتە ئەوەی ژمارەیەکی دیکە لە موسڵمانان جیاببنەوە و چەندین لق و پۆپ دروست بکەن...لەبەر ئەوە هەر لە ئێستاوە ئەوە ڕادەگەیەنم من ئەو گوناهە ناگرمە گەردن, من هیچ فرقەسازی ناکەم. ئەگەر کەسێك بەشوێن مندا بیەوێت لە جیاتی ئەو خەت و مەسیرەی کە دەرەنجامەکەی دەبێتە ئەوەی ئەو ئۆرگانە صەلاحیەتدارە, کە بریتە لە (شورا) دروست بێت و فرقە لەناو بەرێت. ئا ئەوە وێڵبکات و خۆی بیەوێت فیرقە دروستبکات بۆ پەیڕەو کردن لەو بیرو بۆچوننانە ئەوە گوناهی بە گەردنی خۆی, من خۆم بێبەری دەکەم لەو گوناهە ! ! !

******

❀ لـەناو دەرس و باسـەکانمدا ڕێگەیـەك کـە بـۆی دەڕۆم ئەوەیـە: ئیختلافـی (جیاوازی) لە نێوان پەیڕەوانی مەزهەبەکاندا نیسبەت بـە یـەکتر دروسـت نـەبێت, بەڵکو لە یەك تێگەشتن دروستببێت, صەداقەت پەیدا ببێت.

******

❀ دەبێـت هـەتا دەتـوانین هەوڵـدەدەین بـە ڕێـژەیش بێـت وەحـدەت لـەناو مەزهەبەکاندا دروستبکەین, جا نەك تەنها کۆ مەزهەبێك کـە لـەناو یـەك سیسـتمی مەزهەبی گـەورەدا, وەك (چـوار)دا مەزهـەب کـە لـەناو سیسـتمی (تەسـەنوندان ـ شافعی حەنەفی, مالکی, حەنبەلی ـ هەوڵـدەدەین وەحـدەتیان زیـاتر بێـت. هـەتا مەزهەبگـەلێك کـە ئـەوەتان لـەناو سیسـتمی مەزهـەبی جیـادا وەك پـەیڕەوانی مەزهەبی (تەسـەننون) لەگـەڵ پـەیڕەوانی مەزهـەبی (تەشـەیوع)دا کارێـك بکـەین وەحدەی لە نێوان ئەمانەشدا زیاد ببێت.

******

❀ بـە بـوونی مەزهەبـەوە ئیمکـانی نییـە وەحـدەتی واقیعـی و ئومـەتی واحیـد وجودی هەبێت.

******

❀ لە مەیدانی ژیـان و ڕووبـەڕوو بوونـەوەدا ئینسـان دەتوانێـت لەگـەڵ قورئانـدا بێت, ئەگەر لە ناومەیدانی ڕووبـەڕوو بوونـەوەدا نـەبێت و لەگـەڵ قورئانـدا بـوون, ئەوە لەگەڵ قورئاندا بوونێکی تـەنها فکری و عەقڵیە, نەك (لەگەڵ قوئـان بوونێـك) بە تەواوی وجوودەوە.

******

❀ تەنیا هۆی چارە ڕەشییەکانی موسوڵمانان دورکەوتنەوەیان بـوو لـە قورئـان، ئێسـتاکەش تـەنیا هۆکـاری هۆشـیار بوونـەوە و بەختـەوەی و ڕزگـاربوونی

موسـولّمانان، وه نـەجاتیان لـە بەنـد و زنجیری کۆیلەیی دونیاخۆران و داوەکانی خەڵەتاندنیان، هەر گەڕانەوەی بۆلای قورئان، بێجگە لەمە ڕێگەیەکی دروست و سەر ڕاست نییە.

******

❀ ئەر کاتێ ئیمان لە دڵێکا بێ
ئەگەر ئیمان بێ بێدوو بەر نابێ
یەك: بە خەڵك نەخسووس هەژار، مُحبت
یەکتر: بەرامبەر زۆرکاران غیرەت
ئەر کەسێ دایمە لە نوێژ و ڕۆژوو
لە ئەو دوو بەرەی ئیمان بێبەش بوو
یا تێنەگەییوە کە: ئیسلام چییە
بەشێ باشی لە ئیمان نیە
موسوڵمانیەکەی نەگرساوە و کاڵ
هەر وەسە ماڵە ڕملێینەی منال
ئیمانی سوکە هەر وەك کەڕەپوو
(نا قایمترە لە ئیمانی جوو)

******

❀ گەر پەیڕەوی دینی، گیانی کاکەی
پێت سەیر نەبێ کەوایی لە بەندا
پێم سەیرە کە بان و خوار هەبێو تۆش
بەن بیی لە خەمی خەوو ژەمەندا

******

❁ فلآنیی! هەرچەن قورعان زانیش بیی

ئەر خۆشگوزەران یا بە دەماری،

بزانە: تەنیا هومەی زانیینی

لە موسوڵمانیی کز و نەداری.

******

❁ ئەگەر بە ڕاستە بۆ خەڵك پەرۆشی

نەك بەناو مەردم بۆ خۆ تێکۆشە

خۆشەویسی و دڵسۆزی وەبیٚ

کێشانی رەنج و مەینەت چۆن ئەبیٚ؟

سەیرکە: دایکێکی دڵسۆزی فامدار

بۆ خۆشەوییسی چی ئەکا هەموار

تۆ بۆ عاڵەمیٚ دڵت نەناڵیٚ

بەقەو دایکیٚ بۆ تاقە مناڵیٚ!

******

❁ ئەو دڵە وا بۆ هەژاران کوڵ نەدا

زەحمەتە ئیمان تیا جیٚبگریٚ

نەك بەزەیی، قورئان ئەڵیٚ: تۆ بۆ هەژار

گیان ئەدۆریینی کە ئیمان ببیٚ

******

❁ گیانەکەم توخوا لە مێژە بە ناو

دینەو ئەکریٚ زوڵم و ناحەساو

زیاتر لە دوژمن، دۆسگەلی نەفام
خەڵك ئەتارێنن لە ڕێگەی ئیسلام
ئیتر با ئێمەش نەوینە ئافەت
بۆ دین، زیاد نەکەین لە ئوومەت مەینەت
بۆ خاسان مایەی بەدناویی نەویین
حەساویی وە سەر ڕێ خاسان کەویین
******

❁ ئەر تێگەیینێ کاری کردە دڵ
جا تێگەیینە و فامە و پێگەیین
ئەرنە نەزانیی گەلێ باشترە
ئەر هەر بە تەنیا زەیینە تێگەیین
ئاخر ئەو کەسە زەیینی نەزانە
ناتوانێ زۆربا لە مەردم زەرەر
وەلێ زەینێ ساز دڵ نەوو لە تەکیا
ئەگونجێ ببێ بە شەڕ بۆ بەشەر
******

❁ ڕازێك زۆر گرنگ و ئەساسی، کە لە خەودا یان لە ئیلهامدا بۆمان دەردەکەوێت بریتییەلە: شکانی ئەساسیترین قانوونی مادە! کە ئەساسیترین قانوونی مادەش بریتییە لە دوو شت[*]:

---

[*] ) بۆزیاتر تێگەیشتن لەم بارەیەوە، خوێنەر دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەی (سەروەت عەبدوڵا: کاك ئەحمەدی موفتی زادە، هەوڵێك بۆ ناساندنی بەشێك لە بۆچوونە پەروەردەی و فکری و سیاسییەکانی، کتێبی دووەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی سیما، سلێمانی، ٢٠١١).

١. قانونی زمان (یاسای کات).

٢. قانوونی مەکان (یاسای شوێن)

******

❀ مقایەسەی مەرحەلەی ژیانی دوای ئەم ژیانە (ژیانی بەرزەخ) بە نیسبەت ئەم ژیانەی ئێستامانەوە، هەروەك مەرحەلەی ژیانی بەر لەم ژیانەیە (ژیانی ناو رەحمە دایك).

******

❀ هەولبدەن بە وشە و چەمك مەخەلەتێن, زۆر وشە و چەمك هەیە لەرووی زاهیرییەوە بەهێز، هەتا وا دەبینرێت کە بەلگەیان هەیە, زۆر شت هەیە لەمەسەلەی(فەلسەفی و کۆمەلایەتی و سیاسی)ئیستدلالی زۆر دەکرێت و وا پیشان دەدات زۆر بەهێزە، بەلام هەر شتێکی ڕوالەتییە و واقیعیەتێکی نییە و باتلە.

❀ لە قیامەتدا پێکهاتەی (مادە) بە جۆرێکە کە ئەصلی تەغیر(گۆڕان) مەترەح نییە بۆی! بەم شێوەیەی کەئێستا ماددە هەیە بە وجود نایەتەوە، لەبەرئەوە ئەم خصوصییەتەشی نییە کە خصوصییەتی تەغیر(گۆڕان)ە. مەگەر ئیرادەی خوای گەورە شتێك لەناو ببات, ئەگینا لەناو چوونی نییە و، خەصلەتی لەناو چوون نییە..

*****

❀ ماتریالیزم, تەعبیرێکە لەڕیشەی (ماتر)یەوە وەرگیراوە, (ماتر)یش، واتە (مادە), ماتریال. لەزمانی خۆشماندا واتە (مادی), کاتێکیش دەبێتە(ماتریالیزم)و وەردەگێڕرێت بۆ زمانی کوردی دەبێتە(مادیگەری).

ئەم تەعبیرە لە فەلسەفەدا هەیە و کاتێکیش بەکاردەهێنرێت بەمانایی جۆرێك لەجیهانبینی و تەرزی تەفەکور بەکاردەبرێت, بەمانایی ئەوەی کەئینسان فکری

مادی بێت و وا تەصەور بکات کەهەر جیهانی مادی هەیە و غەیرێ جیهانی مادە شتێکی تر نییە.

*****

❁ مرۆڤگەل بە ئیعتیباری بونیادی دەرونی دووجۆرن:

**جۆری یەکەم:** جۆرێك لە مرۆڤەکان یەك شەخصییەتین, مرۆڤگەلێکن کە دژایەتی و ئیزدواجییەت لەشەخصییەتییاندا نییە.

**جۆری دووەم:** ئەمانە مرۆڤانێکن دوو شەخصییەتین, دژایەتی و ئیزدواجییەت لەشەخصییەتییاندا بوونی هەیە.

*****

❁ مەبنای ئیمتیازێ دابەشکردنی مرۆڤەکان بۆ دوو دەستە, بریتییە لەدوو بەش لەدەرونی ئینساندا:

**بەشی یەکەم:** عیبارەتە لەتەرزی تەفەکور و زانیاری و ناسین و ئاگاهیگەلی، واتە ئەوەی کەپەیوەندی بەبەشی (ئاگاهی) ئینسانەوە هەیە, سەمەرە و بەدەست هاتووەکانی(دەرونی ئاگاهی)ئینسان.

**بەشی دووەم:** عیبارەتە لەسیفەت و ئەخلاق و,تایبەتمەندی و خەصڵەتگەلی, کە ئەم پەیوەستە بەدەرونی نائاگاهی ئینسان, حاڵەتگەلێکە کەئینسان بەموقتەزای دەرونی نائاگاهی پەیدای دەکات.

*****

❁ زاڵم و تاوانبار و دین فرۆشان و شەرف فرۆشگەل! هەموو ئەمانە حاڵەتێکی ئەخلاقی مادیگەرییان هەیە، کاتێك سەیری ڕەفتار و کرداریان دەکەیت سەیردەکەیت لایەنی مەعنەوی لەبەرچاویان پووچە وگرنگی پێنادەن, تەنها

گرنگـی و تـەوەجوە بـەمادیات دەدەن, بـۆ نمونـە, پلـە و پایـە و پـارە و مـاڵ و توانایی و هەرچییەك هەیـە هـەر لایـەنی مـادی گرنگـە و غـەیری مادییـان بـەلاوە پووچە.

******

❁ ئایا دین ئایدیالیزمە,یان ماتریالیزم؟ ئەگەر دروست باس بکرێت موتەوەجیهی ئـەوە دەبیـت کـە (دیـن) نـە تـەنها سـەرنج لەلایـەنی واقیـع(دەرەوە) دەدات, نـە تەنهاش سەرنج لەلایەنی(زیهن) دەدات, دین دوو جەمسەری(لایەن) سەیری وجـود دەکات, ئێژێ: جەمسـەرێکی لایـەنی(زیهنـی)ئینسـانە و لایـەنێکی تـری (جیهـانی دەرەوەیە), نە جیهانی دەرەوە بەتـەنها ئەرزشـی هەیـە بەنیسـبەتی ئینسـانەوە، ئەگەر ئینسان زیهنی توانـایی نـەبێت بۆنمونـە وەك(شـێتێك)، نـە زیهنـی ئینسـان بەتـەنها ئـەرزش(بایـەخ)ی هەیـە، ئەگـەر جیهـانی دەرەوە لـە ئیختیاریـدا نـەبێت بۆنمونە وەك ئەمەی ئینسانێك بێنیت لەسەرەتایی تەمەنییەوە تاکۆتـایی تەمـەنی بیخەیتە زیندانەوە. ئـا ئەمە تەرزی تەفەکوری دینییە،کە نە(ئایدیالیزمـە)، تـەنها باوەڕی بە(زیهن) هەبێت, نە (ڕیالیزمە) تەنها باوەڕی بە(دەرەوە ـ واقیع) هـەبیت و نەفی زیهن بکات.

******

# كوردستانی جوانم

چەنای چەن ساڵ كوردستانی جوانم
لە دووریت عالەمم لێ بۆتە زیندان
مەگەر ناوت لەناو ڕۆژنامە موچرك
بخاتە گیانو چاو بێنێتە گریان

وڵاتی خۆشەویستم یاخودا قەت
شەڕی زۆركارو خوێری لێت نەكاكار
خودای ئەو خەڵكە خۆتو ڕۆڵەكانت
بپارێزێ لە فێڵ و داوی بەدكار

لە هەورامانو سارڵت لەبارتر
لەكوێ بێرم كە پێ خۆشكەم دڵی خۆ
گرانە تا بەهەشتی خوا پەیاكەم
كەژو كێوی بە جوانی ئاویەری تۆ

لە دڵ، تارانو دەورەی، ناگرێ جێ
سنەو مەسناوو گریاشانو قارت
بەڵێ ڕاسە شەمێران خۆشە ئەمما
هەموی قوربانی بستێ دەیمەزارت

نە بەندی، گەر وەكی باپیرە گەورەم
بەئازادیش ببم میوانی تاران
دڵم ئێژێ: قەزای بەردێكی سەخناخ
لەسەر تا خواری تارانو شەمێران*

---

*) ناوی یەكێكە لە گەڕەكەكانی شاری(تاران).

ئەمن فاشیستو بەدخوای خەڵکی تر نیم

موبارەك بێ لە هەرکەس نیشتمانی

بەڵام بۆمن هەمو ئێران بەموڵکی

فدای وێڵەی سنەو مەسناوی جوانی

وەتەن ئەلحەق بەهەشتی روی زەوینی

-گەلت-داخی بەجەرگم-زۆر هەژارە-

زەلانی پاییزی ئامانییەت بۆ

دڵی ژاکاوی دوری، بای بەهارە

بەڕاس لایەقتە کوردستانی جوانم

گەلێ ژیرو نەترسو کرژی ئیمان

لەگوێت هەر نەبڕێ یاخوا دەنگی صەڵوات

لەبۆ پێغەمبەرو بۆ ئال و یاران

١٣٦٨/٧/١٦(لە کوچە تاریکەکانی زینداندا نووسراوە)

******

❀ئەو دەردەی کەوتۆتە ناو ئێمەی کورد، ئەوەیە دەبێت بەشیعارو قسە بانگەشە بکەینو کوردبوون بۆتە شیعارو کەلیماتی زلە زلە.

******

❀ تاغوت پەرست بە کەسێك دەڵێن, کە لەجیاتی ئەوەی گوێ لە فەرمانی خوا بگرێ و مەسیری ژیانی خۆی بە پێی دەستوری خودا دیاری بکات, گوێڕاگرێت بۆ فەرمانی ئەربابی دونیا بۆ زوڵم و زۆرداران بۆ پوڵ داران بزانێ

ئەوان چی دەڵێن، بزانی ئەوان چیان پێ خۆشەو بەقسەی ئەوانە بکات, ئەوە تاغوت پەرستە مووەحید نییە.

******

❁ موسوڵمانەکان! میللەتی ئێران, هەموو لە دەردو ئێشی ولادەتی تازەی میللەتدا شەریکین, هەموو زەجرمان کێشاوە, هەموو کوشتەماندا, هەموو زیندان و دوورخستنەوەمان تەحەمول کرد, بەڵام ئاگات لێبێت میللەتی کورد, دەردێکی هەیە سەر باسەی دەردان! زەجری لە ئێوە زۆر تری کێشاوە! میللەتی کورد ناوێرێ بڵێ من میللەتم, ناوێرێ بڵێ من کوردم, میللەتی کورد ئیجازەی نییە بە زمانی خۆی لە فەرمانگەو لە قوتابخانەدا قسە بکات و دەرس بخوێنێت و دەرس بڵێتەوە! میللەتی کورد ئیجازەی نییە بەزمانی خۆی ڕازی دەرونی خۆی دەر ببڕێت و لەسەر کاغەز بینووسێ.

******

❁ برا ئێرانیەکان، خوشکە ئێرانیەکان، هاودەردین شوکور بۆ خودا هیچکاممان لەوی تر جێنەماوین. هەموو لەئەم زەمان و حەیات و تەکانەدا وەکیەك زەجرو ئێش قبوڵ دەکەین و تەحەمول دەکەین، بەڵام برا ئێرانیەکان لەبیرتان دێت ئێوەش زووڵمتان کێشاوە لەم مێژووە نەنگینەدا ئێمەش زوڵمان کێشاوە، ئەگەر بەئومێدی خودا ئەو دەورانی زوڵم و ستەمە لەبەین چوو نابوت بوو، ئەم تاغوت و ئیستیبدادانە ڕوخان و وێران بوون شەراکەتەکەتان لەبیر نەچێتەوە، میللەتی کوردستانتان لەبیر نەچێتەوە. میللەتی کوردی هەروا هاو دەردی ئێوەیە لەهەموو دەردەکانتانا، ئائەو دەردە گەورەیەش هەیە، دەردی مەحرومیەت لە مافی نەتەوەی خۆی.

******

❁ براکانم! لەبیرتان بێت ئەو ڕۆژە کەوا ئێشی زاڵمان تەواو دەبێت میللەت خەریکە موتەوەلید دەبێت و بە ولادەتی ئیفتیخار و سەربەرزی و ئیمان و ئیسلامەوە،

لەبیرتان بێت کە کوردەواری زەجری لەئێوە زۆرتر کێشاوە, هەر کوردەواری نا میللەتانی تریش.

******

❀ لەم دونیایی ئەمڕۆدا ئینسان ڕووی ڕازی بوونی خۆی پیشانی زالّم نەدات، ئەوە خوارترین دەرەجەی جیهادە، کە لە ڕوو بەڕووو بونەوەوی سیاسی ئەمڕۆدا ناسراوە بە(موبارەزەی مەنفهی) ڕوبەڕوبوونەوەی شاراوە.

******

❀ ئەو دەردەی کەوتۆتە ناو ئێمەی کورد، ئەوەیە دەبێت بەشیعارو قسە بانگەشە بکەینو کوردبوون بۆتە شیعارو وشەی زلە زلە.

******

❀ هەندێك دەڵێن: مەلاکان لە خۆپیشاندانەکاندا ئامادەییان نییە ئەوە بێئینصافییە, لەهەر بارودۆخێکدا هەر ڕەهبەرانی دین بەهێز تر بوون, بۆ کوردستان مەرحومی (قازی محمد)دیارە و, مەرحومی(مەلا خەلیل)دیارە, هەروا لەهەر جوڵانەوەیەکدا چ بەهێز چ لاواز تەماشادەکەیت هەر ڕەهبەری دین دیارە, ئەو بێ ئینصافیانە مەکەن.

******

❀ مەسەلەی ئینقلاب مەسەلەی شۆخییەك نییە ! مەسەلەی ئینقلاب، کاتێك گەرەکمانە صەمیمانە و ڕیشەیی و جدی بێ، ئەمە نییە دەستەیەك تەنها دەستەیەك لەناوببات و تەواو، نا .... ئەشێ فیکر و پاشماوە و فەرهەنگی ئەو لەناو کۆمەڵگەدا لابەرێت, ئینجا ئەو ئینقلاب و لەناوچونە کاریگەری هەیە, ئەگەرنا هەزار جار سیستەم و، حوکومەتێك لە ناوبەرە، تا ئەو سیستەم و حوکومەتە لە فکر و فەرهەنگی خەڵکیدا نفوزی هەبێ ئاخری دووبارە سەر هەڵدەداتەوە.

❁ له بابەتی ئینقیلابی فەرهەنگیدا، دوو مەتڵەب زۆر گرنگ و ئەساسی و دەبێت کاری لەسەربکرێت:

یەکەم: ڕەنگدانەوەی ئەشرافی ژیان لە زیندەگیماندا.

دووەم: حاڵەتگەلی غەربزەدەگی(رۆژئاواییبوون) و، زاڵبوونی غەربزەدەگی بەسەرماندا.

******

❁ ئینقلابی ئیسلام وەك باقی ئینقلابگەلی دینی، دژی ئەشرافییەت دەستیپێکرد, ئەوە وا بە شێوەی ئەشرافییەت لە کۆشکی سەڵتەنەتەوە تا سەرۆکی عەشرەتەکان، لە کۆمەڵگەکاندا دەبینرا هەوڵیدا هەمووی بسرێتەوە و لەناوی ببات!

******

❁ میللەت! هەر کەسێك بەقەدەر زانینی خۆی تەکلیفی لەسەرە تەکلیفی من ئەوەیە، ئەگەر زمانیشم ببڕن ئەوە ووتم و دەیڵێم خوام بەسەو، ئەگەر عیدامیشم بکەن، لەوەو دوا بەسەر بەرزی دەگەڕێمەوە بۆلای خوا، زۆر لە ئەصحاب و خۆشەویستانی پێغەمبەر کوژران و عیدام کران، بەڵام ئێستاش لە ئێمە سەر بەرز ترن و لە ئێمە زینو ترن و پیاو ترن، منیش ئەوەندەم زانی و ئەوەندەم دەرك پێ کرد ووتم و هەرچی بوو بوو.

******

❁ زۆرێك لەو بابەتانەی لەکۆمەڵگای ئێمەدا دەخرێنە ڕوو ئەم بابەتانە بوونەتە هۆی لێکترازان و پارچە پارچە بوون، لەژێر دوو وشەی ستەم و سەرکوتکردندا کورت دەکرێنەوە لەجۆرەکانی ستەمیش، ستەمی نەتەوەیی و ئاینی و چینایەتی، دەبینی کۆمەڵگای ئێمە بەڕادەیەك لەچەمکی ئازادی دەربڕینی هزر و خواست و ئارەزووەکان دور کەوتۆتەوە، کاتێك باس لە لابردنی یەکێك لەم ستەمانە دەکرێت

تەنانەت هزرمەنترین کەسانی نێو کۆمەڵگای ئێمە، تەنانەت کەسانێك، لەئاستی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگادان تاڕادەیەك توشی شڵەژانو گوماندەبن، بۆنمونە کاتێك باس لەمافی نەتەوەیی نەتەوەکان دەکرێت باس لە (خودموختاری)—خۆبەڕێوەبردن—ی نەتەوەکان لەلایەن خۆیانەوەدەکرێت، دەبینی زۆرێك لەخاوەن ڕایان ئەم گوزارشتە دەگەیەننە سنوری پارچە پارچەکردنی وڵات، لەکاتێکدا هیچ پەیوەندیەکی عەقلانی و لۆژیکی لەنێوان خۆ بەڕێوەبردنی گەلانو جیاخوازیدا نییە، بەڵکو بەپێچەوانەی سەپاندنی بەزۆر یەکگرتنی گەلان هۆکاری پارچە پارچە بونە، نەك خودموختاری و خۆ بەڕێوەبردنی گەلان.

❀ قورئان بەئێمەی حاڵی دەکات کە(ترس)بەهۆی سێ شتەوە دادەمەزرێت:

زۆر: ئینسانی بێ ئیمانی فاسدی وا هەن کە زۆر و دەسەڵاتی سیاسی و هێز پەیدادەکەن و خەڵك ناچاردەکەن بەوەی ڕەمزی تەوحید و یەکتاپەرستی بگۆڕن و وردە وردە عیبادەتی ئەوان بکەن و فێری ئەوە ببن گوێ بۆ ئەوان ڕابگرن, ئەوانی چییان پێ خۆشە ئەوە بڵێن.

پارە: برێك لە خەڵکی هەر لەڕێگەی فروفێڵەوە(پارە)لەلای خۆیان کۆدەکەنەوە و لەئەنجامی ئەو پارە زۆرییەوە خەڵك ناچار دەکەن, چونکە پێویستیان بەپارەکەی ئەوان هەیە فێرببن ڕێزێکیان بۆ دەربڕن و لەبەرامبەریانەوە قوربان قوربانیان بۆ بکەن.

بە قسەکردن: دەستەیەکی ترهەن هەر بەقسە خەڵکی زەوج دەکەن! ! وەك ئەوانەی ئەو هەموو حەدیسەیان بەدەمی پێغەمبەرەوە(ﷺ)دروست کرد, قسەی پڕپێچ و قەمچ دروست دەکەن و حەقیقەتی ڕوون و ئاشکرای قورئان لەخەڵکی دەشارنەوە.

❁ لەگەرمەی جیهادی دینیدا ئینسانی خائین دەردەکەوێت! ئەگەر وردە وردە قسە بکەیت هەرگیز ئینسانی خائین دەرناکەوێت, زۆر توند حەقیقەت بڵێ بازۆر توند ئینسانە خائین و مەلا خائینەکان ڕسوا بن و خەجاڵەت ببنەوە، ئەگەر ئێوە بەو توندییە جیهاد بکەن هەم زۆر زووتر خەڵك وریا دەبێتەوە, هەم یەکەیەکەیەکیش لەناو ئەو مەلایانەدا ئاخری خەجاڵەت دەبنەوە و دێن بەرەو ڕێگای حەق.

******

❁ وانەزانن(ناسیۆنالیستی) بەناونیشانی ئەمە کەدەبێت کێشەی نەتەوایەتی لەناوبچێت لەسەدەی تازەدا مەترەح بووە, نەخێر..لەئیسلامدا بۆ لەناوبردنی(فاصیلەی نەتەوایەتی) هەم دەستوری زۆر گرنگ دراوە لە(ئایات و حەدیس)دا، هەم لەکردەوەشدا نمونەی بەرچاو هەیە لەیەکەمین هەنگاوەکاندا کە نراوە بۆ تەشکیلکردنی کاکڵەی کۆمەڵگەی ئایندەی ئیسلامی بەم جۆرە هەنگاونراوە: کە هیچ فاصیلەیەك لە نێوان میللەت و نەژادگەلدا نەمێنێت...

******

❁ میللەتی کورد ئەوەی دەوێت ئەو(سێ) جۆرە ستەمەی لە کۆڵبێتەوە–(ستەمی نەتەوەیی– مەزهەبی– چینایەتی)–، کەجۆرێك لەستەمەکان(ستەمی نەتەوەییە)،ئەمەش لەسەردەمی(کۆرش) تاکۆتاییەکانی(پەیمانی ئاریامهر) بەردەوامی هەبوو. کەخەڵکی لەمافە نەتەوەییەکانی بەهەر شێوەیەك بێت لەشێوەکان بێبەش کراون.

******

❁ئیسلام بۆ تەواوی کێشەی بەشەری بەرنامەی هەیە، هەروا بۆ بابەتە نەتەوەییەکان هەیەتی بۆ تەواوی بابەتەکانی تریش هەیەتی، هەروا بۆ ئازادی ویستی و مەزهەب هەیەتی، بۆ تەواوی بابەتەکانی تر هەیەتی, هیچ مەسەلەیەك

لەمەسائیلی ئینسانی نییە کە بەرنامەی نەبێت بۆی، وەکو هیچ مەکتەبێکی تر نییە! هیچ مەکتەبێکمان نییە کەبۆ تەواوی بابەتە ئینسانییەکان بەرنامەی هەبێت، بەلاَم ئەوە تەنها ئیسلامە بۆ تەواوی مەسائیلی ئینسانی بەرنامەی هەیە...

******

❁ حیزبی تودە حەزدەکات خۆی ئازاد بێت، بەلاَم قینییەتی لە ئازادییەك لەئێستا لە کۆمەڵگەی ئێراندا بەرقەرار بێت لەڕووی سیاسییەوە، چونکە ئەزموونی تاڵی ئەورووپای ڕۆژئاوا و ولاَتانی سەرمایەدار دەریخست کە ئازادی سیاسی دەبێتە هۆکاری محفبوونەوە(پوکانەوە)ی (مارکسییەت)، مارکسییەت تبقی ئەو مەزهەبەی کەهەیەتی دەبێت لە ولاَتگەلی سەرمایەداریدا ئینقیلاب ببێت دەی یەك دانە ئینقلاب لەولاَتگەلی سەرمایەداری ڕۆژهەلاَت و ڕۆژئاوادا نەکریا!! بەڵکو لەسادەترین و مەحروم ترین ولاَتگەلدا ئینقلابی مارکسی کرا کەلەڕووی فەرهەنگی و ئاگاهییەوە مەحرومن ئەی ئەمە لەبەرچی، دەلیلی چی بوو؟ دەلیلی ئەوەیە کە بەڕاستی زیاتر لەوەی کە محتەوای مارکسی خەڵکی ڕابکێشێت، شەخصییەتی بازیگری و شیعارگەلی خەڵکی ڕادەکێشێت و جەلبیان دەکات، ئەم شەخصییەتی بازیگری و شیعارگەرییەش لەو شوێنانەدا کار دەکات کەئاگاهی خەڵکی لەخوارەوە ببێت(واتە خەڵك زۆر ڕۆشنبیر نەبن).. لەشوێنێکدا ئازادی سیاسی زۆر بێت ئاگاهی خەڵکی سەردەکەوێت، بەپێچەوانەشەوە لەشوێنێکدا ئازادی سیاسی کەم بێت ئاگاهی خەڵکی دێتە خوارەوە، بینا لەسەر ئەمە حیزبە مارکسییەکان بەسودوەرگرتن لەئەزموونی تاڵی ولاَتگەلێك لەڕووی سیاسییەوە دیموکراتیك (کە مەفهومی دیموکراتی لە ڕووی سیاسییەوە لەناویاندایە)، کەبیری ئازادی دەرکی خەڵکی پێشدەخات ڕۆژ بەڕۆژ ئەحزاب و لایەنگرانی مارکسییەت بەرەو کەم بوونەوە دەڕوات و حیزبە مارکسییەکان وردە وردە شکست دەخۆن و دێنە دواوە، ئەم دەرئەنجامە

دەگرن کەلە کۆمەڵگەیەدا خەفەکردن بوونی هەبێت، فشاری هەبێت مارکسیست گەشەدەکات! حەقیقەتەنیش ئەمە ئەنجامگیرییەکی دروستە دەستیان کەوتووە.

******

❀(ئیستبداد) بەوشێوەیە دروست دەبێت، کە ئەو کەسەی حوکمەتی بەدەستەوەیە خراپی دەکات و بەدروستی ڕووبەڕووی ئەو خۆپیشاندان و ڕەخنەو داواکارییانە نابێتەوە کە خەڵکی بەهۆی خراپییەکانیەوە دەری دەبڕن، حەز دەکات سنوردار بکرێت و بێ دەنگ بکرێت، دەی وردە وردە ئەم کارانە دەکات تادەبێتە خراپترین حوکمەتی دیکتاتۆر، ئەساسی دیکتاتۆری لێرەوە پەیدا دەبێت.

******

❀ چۆن چەك بدەمەدەست کەسێکەوە کە هێشتا ئیسلامی نەناسیووە لەبەرامبەر لایەن و قوتابخانەیەکەوە بوەستێت ئەویش هێشتا ئیسلامی نەناسیوە؟ نابەرپرسیاریەتی و بەهیچ زانینی خوێنی ئەم میللەتە لای ئەوگروپانە گەشتوەتە ئاستێك خەڵکی بەموستەحەقی ئەوەدەزانن بکوژرێن...!

******

❀ ئەو ئینقلابە وا ئێمە خستبوومانە ڕێگەوە ئەو حەرەکەتە وا بە تەدریج و ووردە ووردە دەڕۆشتە پێشەوە هەروا بڕۆشتایەتە پێشەوە حیسابمانکردبوو لای کەم(١٠–١٥) ساڵی تری دەویست، کەمیللەتی کورد بەباشی و وردی حاڵی بێت لەحەق و ناحەق. حیسابی حاڵی بوێت لەعەدالەت و زوڵم، حیسابی حاڵی بوێت لەئیسلام و دەربار و تەکیەو خانەقاو جیاوازی ئەمانە بناسێت و جیایان بکاتەوە، تێبگات چ زوڵمێکی لێکراوە، چ بەشگەلێکی خوراوە، ئەمانە بەباشی دەرك بکات. بەڕاستی کاتێك حەرەکەتی ئینقلابی دەستی پێکرد بەتەواو تواناوە بڕواتە پێشەوە لەوانەیە نەك تەنها میللەتی کورد، بەڵکو باقی میللەتی مەحرومی ئێرانیش گشتی ڕزگار بکات.

******

❀ ئینقلابی ئێران، وەك ئەم بەرنامە سەتحیانە بوو، وەك ئەوەی زۆر بهێنی بۆ منداڵێك کەدەبێت هەر خوێندەوار و زیرەك بێت، بە پەلە بوو-میللەتی بەپەلە خستە ڕێ، لەکاتێکدا دەبوو ساڵەهای ساڵ درێژەی بکێشایە، بە هەر حاڵ نیگەران بووین ئەم ئینقلابە سەتحییە ببێتە هۆکاری ئینقلابەکەی ئێمەش، ئەمەش لەبەرئەوەی کاتێك سەتحییانەیە-ئینقلاب- ناتوانێت خۆی لەدەستی پیلانی ئیستیعمارەوە بپارێزێت.

******

❀ سەروەت و شتێك کەبەدەستی دەهێنن بۆ هەموو مرۆڤایەتییە، میللەتە بچوکەکانی ئێران کە لەژێر ناونیشانی وولاتی ئێراندا لەیەك نەخشەی جوگرافیدا کۆبوونەتەوە بەلایەنی کەمەوە جێبەجێکردنی ئەم یاسا قورئانییە کەهەر سەروەتێك لەم ولاتەدا بەدەست بێت دەبێت بۆ هەموو میللەتی ئێران سەرفبکرێت.

❀ یەکێك لەدەردەکانی سەرکردە، دەردی (قەیدی خۆپارێزی)ە. پێم دەڵێن:"فلانەکەس هەروا لەخۆتەوە دەڕۆیتە دەرەوە لەوەخت و بێ وەختدا، لەکاتێکدا تۆ ئەم گشتە شتەت هەیە". هەوڵیاندەدا قەید و پەرژین بەدەورمدا درووست بکرێت بۆئەوەی بمپارێزن. دەی ئاخر ئەوە بەکەڵکی چی دێت؟! واگیرام سەد ساڵ تەمەنمکرد؟ ڕۆژێك ئەرزشی هەیە کەوەك پێغەمبەران بچینە ناو خەڵکیەوە. خۆ لە(علی و عومەر) لەپێشتر نیم، دەی(حەزرەتی عومەر) چوو بۆ مزگەوت و کابرای تاوانبار هات و لەکاتی ئیمامەتدا دەدات لێی و شەهیدی دەکات، (علی) دەکەوێتە ڕێ بۆ نوێژی بەیانیو لەتاریکی بەیانیدا، چونکە پارێزەری نییە، ئەو بەدبەختە خۆی دادەشارێتو شەهیدی دەکات، ئەگەر ڕاستدەکەم ئەو ئەمانەتەی خوا(دین) بگەیەنمە ئەم ئەمانەتەی خوا-خەڵك، ئەوەیە دەبێت وەك ئەوان ڕەفتاربکەم.

******

❁ ئێستا لەم قۆناغە ناسکەی مێژووسازی ئێمە، نەك تەنها لەبەرامبەر جیهانی ئیسلامییەوە، بەڵکو لەبەرامبەر مرۆڤایەتیی‌و مێژووی ئایندە بەرپرسیارێتیمان هەیە.

******

❁ داگیرکەران، بۆئەوەی تەفرەقە بخەنە ناو میللەتەوەو خەڵکی لە قورئان دوور بخەنەوە، دەیانوویت ووشەی عەرەبی لاببەن(لاشیان دەبرد)، بەلأم ووشەی فەرهەنگەکانی دیکە قەیناکا، ئەم کارانەش تەنها بۆ ئەوەبوو بێگانەمان بکەنەوە لەئیسلام، تاوەکو باش بتوانن حوکم بکەن بەسەرماندا. هەر کات دڵەکان پەیوەندیان بەئیسلامەوە نەما، پاشان ئەو بەرنامەیەیی خۆیان بێنن بەناوی ئازادییەوە بیسەپێنن بەسەرماندا، ئەوکاتە زۆر ئاسان دەتوانن سواری ملی ئەم میللەتە بن.

******

❁ لەناو زینداندا هەمیشە بیری ئەوەم دەکردەوە، ئاخۆ ئێستە بڕۆمە ناو شارو گوێچکە شل بکەم، کابرای کرێکارو برای خۆشەویستی خزمەتگوزارم، (کەقەزای کەل و پەل و کۆڵەپشتیەکەی ناو شانی ئەخەم لە هەزار پانتۆڵی ئەشرافی پڕ شەوق‌و زەوق)، برای حەماڵم چۆن قسە دەکات، کاتێك خەریکە بارێك هەڵدەگرێت، بۆئەوەی بیگەیەنێتە مالآن؟ {واتە، چی وشیەك بەکاردەهێنێت؟}

******

❁ خودموختاری بۆ کورد،لایەنی کەمی،دابینکردنی داواکارییەکانی میللەتە، واتە بەشەرعی‌و لە دیدگای ئیسلامەوە پێش خودموختاری، ئێمەش مافمان هەیە، بەلأم ئەمە ڕادەی کەمییەتی، لەئێستادا دەبێت ئەم(مافە کەمە) تەئمین و(جێگیر ببێت)، دواتر ئەگەر لە ڕووانگەی ئازادی‌و دەرکی دیمکراتییەوە بەرەوپێش چووین، بەقۆناغێك دەگەین دەتوانین لە(خودموختاری) زیاتر داوا بکەین.

❁ خودموختــاری، تــەنها بــۆ کوردســتان نییــەو کۆمــاری ئیســلامیو هــەموو چینەکانی(بلـوج–عـەرەب–کـورد– تورکمـانو فـارس) دەگرێتـەوە، ئەمـەش پایـەی ناسیۆنالیستییە.

******

❁ لـە بنەڕەتـدا خودموختـاری بـەو مانایـە نییـە، کەئێسـتا بلاوبۆتـەوە ئەوانـەی کوردنین لەکوردستاندا مافی ژیانیان نییە. ئەم شیعارانە لە لایـەن دوژمنـانی کـوردو نەژاد پەرستەکانەوە بلاودەکرێتـەوە، تــاهەستی نەتـەوەیی خۆتـان بـۆ پارێزگـاری کردن لە کوردستان بپـارێزن، بـەلام غێـر کوردەکـان تـا ئـەو کاتـەی دەیانـەوێت لـە کوردستاندا بژین، پێلاویان لەسەر چاوانە خزمەتگوزاری و دابینکارییەکانی ئەوان بۆ ئێمە جێگەی گرنگی پێدانە.

******

❁ بەڕاسـتی کەسـێك زمـانی کـوردی بەلـەد بێـت دەزانێـت دەریایەکـە ئەمـە زۆر سەیرە! زمانی کوردی لە سەرەتاوە دابەش ناکرێت بەسەر لەهجەکاندا، ئەگەر مرۆڤ لە ڕووی زمان ناسیەوە بیلێت ناکرێت بلێیت زمانی کوردی چەند دانە(لەهجە) یەکـە، لەسەرەتادا دابەش دەکرێتە چەند نیوە زمانێك، خۆ(سۆرانی)لەهجە نییە(کرمـانجی) لەهجـە نییـە(لـوڕی و هـەورامی) لەهجـە نـین، ئەمانـە خۆیـان کەمینـە زمـانێکن، ئەوەندەش گەورەن هەر یەکەیان خەریکە بە زمانێکی تەواوی حساب بکرێت، بەلام لە ڕووی ڕیشەی زمانەوانی و لـە ڕووی(صـەرف) و ڕسـتە سـازییەوە بـە نیـوە زمـان حساب دەکرێت.

ئەم نیوە زمانانە هەر یەکەیان چەندین لە هجەی تێدایە، ئە ئێستا بۆ نمونە(سۆرانی) سەیر بکە لەهجەی(سنە، قـوروە، کـامێران، مـەریوان، سـلێمانی، کـەرکوك، بۆکـان، سابلاخ، سەردەشت، لایجان) ئەمانـە گشـتی لەهجـەی جیـاوازی سـۆرانییە، دەزانـن چەند لەهجەیەو چەنێك زۆرو فراوانە؟! دەتوانیت بلێیت(سنە)یی یەك لەهجەیە،

لەهجەیەکە لە(سۆرانی)،(سۆرانی) نیوە زمانە، ناتوانیت بڵێت سۆرانی لەهجەیە، هەمووشیان سەر بە زمانی کوردین.

(سابلاغی)یەك لەهجەیە لە(سۆرانی) لە زمانی کوردی، هەر بەو جۆرە نیوە زمانەکانی دیکەش وان و دەبینین.

******

❁ تەرحێك بۆ یاسای بنچنەی کرابێت بەبێ ئامادەبوونی نوێنەرانی ڕاستەقینەی کورد، یان لە ژوورێکی داخراودا بەنهێنی بنوسرێت و ئەو کاتە پیشانی خەڵکی عام بدرێت، ڕەفزە و قبوڵ نەکراوە.

******

❁ (لە دانیشتنەکانم لەگەڵ دیموکرات و کۆمەڵە و...)باسی ئەوەم بۆ دەکرد: ئەگەر هەموو میللەتی کورد بە گەورەو بچوکیەوە بە منالییەوە لە بەرامبەر ئەم حوکومەتەوە بوەستن ناتوانن و دەرەقەتی نایەن، ئەمەش لەبەر ئەوەی ئەمجارە حوکومەت تەواوی میللەتی ئێران لەگەڵدایە, بەکردەوەش دەیبینن! میللەتی ئێرانی بە درێژای چەندین سەدەیە خەون بە حوکومەتێکی واوە دەبینێ، ڕاستە حوکومەتی پڕ بووە لە فەساد بە ئاسانی بەری نادات کاتی دەوێت تا پشتی ئەم حوکومەتە خاڵی بکرێت، پشتی میللەتی کورد دەشکێنێت!! ئاخری میللەتی کورد ئەشکێ و غاڵیبانەو بە ئاسانی دێنە ناو کوردستانەوە جا ئەم سەفەرە پەیوەندی حوکومەت لەگەڵ میللەتی کوردا نابێتە ئەم پەیوەندییە کە ئێستا هەیەتی* ...

******

---

*) وەك دیارە و لە نووسراوە مێژوویەکاندا باسکراوە لەسەرەتای ئیقلاب و ماوەیەك دوای ئینقلاب، پێش ئەوەی ڕوو بەڕوو بوونەوەی چەکداری لە نێوان پێشمەرگە و سوپای پاسداراندا دروستت ببێ، کۆماری ئێران هەوڵیداوە لە ڕێگەی گفتوگۆو نوێنەرەوە قسە لەگەڵ سەرکردایەتی کورد بکات، بۆیە کاك ئەحمەد دەڵێت: با ئەم هەلی گفتوگۆیە لەدەست نەدەین و شتێك بۆ کورد ببچڕین...

❁ من چۆن ئەصڵەحە بدەمە دەست کەسێکەوە، کە هێشتا ئیسلامی نە ناسیووە و لەبەرامبەر جیهەت و مەردمێکەوە بوەستن کە ئەوانیش هێشتا ئیسلامیان نە ناسیووە.

******

❁ لە مێژوی ئیسلامدا گەورەترین کێشەیەك کە ڕێگەی نەداوە حەرەکەت و بزوتنەوە و ئینقلابەکان کۆمەڵگە بکەنە کۆمەڵگەیەکی تەواو ئیسلامی, وجودی حکومەت بووە! لە لایەنەکانی ترەوە کێشەی زۆر گەورەی نەبووە، کێشەکەی لە ڕووی سیاسی هێزی حاکمەوە بووە.

******

❁ لاوی کوردم خۆت نەکەیتە داردەستی دوژمنت

دوژمنت نەتباتە مەیدان بۆ برای خۆ کوشتنت

---

❁ هەمیشە بۆ (دیموکرات و کۆمەڵە و....) ڕووندەکردەوە: وەرن شەڕ مەبارێنن بەسەر میللەتی کوردا, ئاخر (فیدائی یان حیزبی تودە)* لە ناوەڕاستی ئێرانەوە ئارەزوی هەس دژی حوکومەت کار بکات بۆچی بەدبەختیەکەی بەسەر میللەتی کوردا بێت؟!

وەرن ئەم بەدبەختیە مەڕێژن، (ئەم حوکومەتە فەرقی هەیە لەگەڵ حوکومەتی جاراندا)** , ئەمە تەنها ئەرتەشی نییە, ئەگەر واش بێت میللەتەکەی هەر وا لەگەڵیدا و, کاتی دەوێت ئەم میللەتە ئاگادار بێت و دەست لەم حوکومەتە بەر بدات!

---

*) چریکەی فیدای و تودە: دوو حیزبی چەپی ئێرانی سەردەمی ئینقلابن...

**) نازن ئەو کەسانەی لەم وتەیەی (کاك ئەحمەد) تێنەگەشتوون! وا حاڵی بوون ئەم قسەیە لایەنگرییە بۆ دەسەڵات، نەیانزانییوە مەبەستی ئەوەیە: ئەگەر حوکمەتی جاران (واتە: شاه) تەنها سوپای هەبووایە و میللەت دژی بوونایە، ئێستا گۆراوە، لەگەڵ ئەوەی سوپای هەیە لەهەمانکاتدا میللەتیشی لەگەڵدایە، ئەگەر بە شەر بەسەر سوپادا سەرکەویت، ـ کە دیار بوو مەحال بوو ـ ئەوا ناتوانیت میللەتی ئێران حاڵی بکەیت ئەم حوکمەتە تازە ئینقلابییە دوچاری فەساد بۆتەوە، دەی کەوابوو وەرن لە ڕێگەی گفتوگۆوە ئەم کێشەمان چارە بکەین...

میللەتی کوردی بێچارە مەکەن بە دژی ئەرتەش و تەواو میللەتی ئێراندا, بەدبەختی مەوارێنە بەسەریدا, شەرائیتی جوگرافیای میللەتی کوردم روندەکردەوە چ لە ئێراندا بێ، چ لە عێراقدا بێ، چ لە سوریدا بێ ئیمکانی نییە بێ پشت بەستن بە هاوسێکان و ناتوانێ, چونکە دەورە دراوە بەم مەملەکەتگەلە, ئەم هاوسێگەلە کۆمەکییان تا سەر نییە, ئێسە حوکومەتی (بەعس) ئەگەر کۆمەکت بکان تا سەر نییە, هەر کاتێك مەیلیان بوو پەیمانێك دەبەستن و هەرچی ئاشە تەواو دەبێت, شەڕی میللەتی کورد تەواو دەبێت, جارەهاو جارەها ئەمانەم دەووت, تەماشات دەکرد لە دانیشتنەکاندا دەیانووت: ئەرەوەلاّ شەڕ خەیانەتە و میللەتی کورد ناتوانێ شەڕ بکات ... بەلاّم دوای دانیشتنەکە پێچەوانەکەیان دەکرد... ئەمانەشم لەڕووی ئەمەوە کرد، کە دەستوری ئیسلام بەم شێوەیەیە...

---

❁ ڕێگەی میللەتی کورد ڕێگەی چەکداری نییە, (کۆمەڵە و دیموکراتو ....) بێن با (تەوافوق)* بکەین, بەڕێگەی سیاسی، بەڕێگەی بەحس و موزاکەرە مشکیلەی میللەتی کورد حەلبێت, ئەگەر ئارەزووتان ئەوەیە حقوقی میللەتی کورد بسێنن ئەم حوکومەتە ئێستا ئارەزووی هەیە, چەند جار ئێران ئامادەبیان کردوە کە ئێوە بێ ئیختیلاف و تەفرەقەیەك قسەی واحید بێنن تا ئێمە کار بکەین و ئەنجامی بدەین, کورە بێن با لەم فرسەتە ئیسفادە بکەین, لەوانەیە تاسەر نەبێت، شایەت مەوزوعی گۆڕا! ئەم حوکومەتە شایات ئەوزاع و ئەحواڵێکی تری بۆ هاتە پێشەوە, ئەم میللەتە بەدبەختە ساڵهایە لەگشت جێگایەکەوە زوڵمی لێدەکرێت، وەرن ئەم حوکومەتە لەم سەردەمەیدا

---

*) کاك ئەحمەد لەو سەردەمەدا داوایکردووە، کە کێشەی کورد لە رێگەی (تەوافوق)ەوە چارەسە بکەن، کە (کوردی عێراق) لە ساڵی (٢٠٠٣) و داوی روخانی (صەدم حسێن) توانیان ژیرانە بەو رێگەیەی کاك ئەحمەد کاربکەن و هیچ نەبێت بەشێك لە مافەکانی میللەت بەدەست بهێنن.

ئامادەگی هەیە, فورسەت تەڵەبی نەکەین و, دەست نەکەینە خۆ بردنە پێشەوەو, بەشکوم ئیمتیازاتێك بسێنین بۆ خۆمان, هەوڵ بدەین لە ڕێگەی موزەکەرەوە موشکیلەی میللەت حەلبکەین و حەقێکی پێ بدرێت.

******

❁ دەمووت وەرن ئەم هەلە لەدەست مەدەن, ئەمانە لەدەست بدەن لە کۆتاییەوە دەگۆڕێن, خۆ ئەمانە (حوکومەت) موسوڵمانی بە ئاگا نین و ئەگەر زۆر بوون و دەسەلاتیان پەیداکرد شەڕ دەکەن و زوڵم و زۆر دەکەن. هەروەك سروشتی ئینسانگەلێك غروری پیرۆزێ و زۆری دەدات لە کەلەیان بەو شێوە ڕەفتار دەکەن و پەیوەندییان دەبێتە پەیوەندی زۆر و کەم و بەڕۆحی فەتحکردنەوە داغڵ دەبن و میللەتی کورد لە حوکمەتی پەهلەوی فرە فرەتر سەرکوت دەکەن .

---

❁ حوکمەتی ئیسلامی واتە(شورا)، جگە لە شورا حوکمەتی ئیسلامی هیچ شتێك نییە..!

******

❁ بەڕاستی,ئەگەر ئەوانە وا ئیختیاری ئەم ئینقلابە* وا لە دەستیاندایە فەهم و ئیخلاسی ئیسلامیان ببوایە, ئەم ئینقلابە ئەرزشی خوێنی تەواو شەهیدانی مێژووی ئیسلامی دەبوو، ئەوەندە کارێکی گرنگ بوو.

******

❁ ئەگەر حکومەت ببێتە ئیسلامی ئیتر سیاسەتی جیا لە دین هیچ مانایەکی نییە, و دینی جیا لە سیاسەت واتایەکی نییە.

---

* ) مەبەست لە(ئەم ئینقلابە) ئینقلابی گەلانی ئێرانە لە ساڵی (١٩٧٩)دا، و مەبەستیش لە (ئەوان): سەرانی حوکەمەتی ئیسلامی ئێرانە، کە لەوکاتەدا و دوای ئینقلاب دەستەلاتیان گرتە دەست...

******

❁ ئەگەر (شورا) بۆچونێکی هەبێت و ڕایبگەیەنێت و مونتەبیق نەبێت لەگەڵ ڕۆحی تەشریعی ئیسلامیدا، لەگەڵ مەتالّب و مەوازینی ئەصلی (کتاب و سوونەت)دا، یەك کەسی بیریار بۆچوونێك بلّێت و بۆچوونەکەی موافیق بێت لەگەڵ ڕۆحی تەشریعی ئیسلامیدا خوای گەورە ئەو ناموافقە بەناوی دین قبوڵ دەکات[*]! بۆچوونی یەك کەس یان دوو یان سێ کەس بیرمەند، بەلاّم ئیجماع لەسەری دانەمەزرێت ئەگەرچی موافق بێت لەگەڵ مەوازینی دین و لەوەدوا تەحقیقکرا دروستە ئەوە خوا بەناوی دین قبوڵی ناکات و دروس نییە موسوڵمانگەل شوێنی بکەون{چونکە ئیجماع لەسەری دانەمەزراوە} ، بەلاّم ئەو بۆچوونەی شورای بیرمەندەکان قبوڵی دەکەن و لەسەری ڕێکدەکەون و دەبێتە ئیجماع و خوای گەورە ئەوەی قبوڵە و، موسوڵمانان دەبێت شوێن ئەوە بکەون هەرچەندە نادروستیش بێت. {ئائەمە لەبەرئەوەیە بە هیچ شێوەیەك تڕازان و تەفرەقە نەکەوێتە ڕیزی موسوڵمانانەوە} . ئەمە دەریدەخات تەفرەقە و تەقسیمی یەکە یەکە ناپەسەندە و ئیجماع و وەحدەتی کۆمەڵگە لە ڕێگەی شوراوە لەلایەن ئیسلامەوە گرنگە ! (ئەگەر گریمان لە سەردەمێکدا بۆچونێکی نادروست بێت، بەلاّم ئیجماعی لەسەربێت ئێمەی موسوڵمانگەل بۆئەوەی دوچاری تەفرەقە نەبین موکەلەفین بکەوینە شوێن بۆچوونە نادروستەکە).

******

❁ لە دونیای ئیسلامدا، لەدوای ئەو (٣٠ ساڵە)ی خەلافەتەوە، کە لە فەرموودەدا ئاماژەی بۆ کراوە، لەو ڕۆژەوە کە (موعاویە) گەیشتە ئیمامداری ئیتر (شورا) نەماوە، چونکە ئەساسی مەسەلەی کۆمەڵگە، کە تەشکیلی حوکمەتە و بەخودی (شورا) دەکرێت و (شورا) بەرنامە دادەنێت (کێ)بکاتە (خەلیفە) یان (ئەمیرولموئمینین) یان

---

[*] )ئەمەی کە دەڵێن : (نا دروست) گریمانەیە، ئەگەرنا بە فعلی دەرکەوت ڕەئێکی ئیجماع نا دروستە ئەوە دەبێت لێکۆڵینەوە بکەن و بکەونە شوێن ڕەئییە دروستەکە، ئەمە گریمانەی ئەوەیە لە ئایندەدا دەردەکەوێت نادروستە و لە سەردەمی خۆیدا دەرناکەوێت نادروستە، ئەگەرنا دەرکەوت نادروستە ئەوە وێڵیدەکەن و دەکەونە شوێن بۆچوونە دروستەکە (کاك ئەحمەدی موفتی زادە).

(بەرپرسی ئیدارەی کۆمەڵگە) ئەمانە بە شورا نەکرا، چونکە ئەگەر شورا هەبوایە (موعاویە) لادەبرا و قبوڵنەدەکرا، لێرەشەوە بەدبەختی موسوڵمانان دەستی پێکرد، ئەمەش بوویە هۆی ئەوە (دین) بەناوی واقیعییەکەی خۆی نەما، چونکە رووکنی سێیەم کە (ئیجماعە) نەما! لەکاتەوە خەڵك خۆیان بەتابیعی رووکنی یەکەم و دووەم دەزانی، کە (قورئان و سوننەتە)، بەڵام لەبەر نەمانی رووکنی سێیەم (دین) مانای واقیعی خۆی لەدەستدا، دەشبینین لەسەدەمی (موعاوییە)وە یەك مەسەلەی ئیجماع وجودی نییە!

---

❀ ئەگەر هەموو کاڵا مادی و مەعنەوییەکانی بازاڕی سیاسەتم پێشکەش بکەن کڕیاریان نیم، چ ئەگەر لەبەرامبەر شاردنەوەی حەقیقەتێك یان تەسلیم بوون بە خیلافێك، ئەوەی لەلای من جێگەی بایەخ و گرنگییە تەنها ئیسلامی بوونی حوکمەتە و خۆشبەختی میللەت. و الله علی ما نقول وکیل*.

******

❀ پاوانخوازی لە هێزدا ترسناکترین هۆکاری دووبەرەکی(تفرق)ەیە.

******

❀ کێشەکانی کۆمەڵگەکەمان لە سێ وشەدا کوتمانکردۆتەوە (ستەمی نەتەوەی، ستەمی مەزهەبی، ستەمی چینایەتی).

******

❀ یەك هەڵە لە پەیوەندی (عەقیدە و پەیوەندی ئەخلاقی)دا، دەکرێت بە ئاسانی جوبران بکرێتەوە، یان ئەگەر قابیلی جوبرانیش نەبێت کاریگەریکەی کەم و سنور دارە، بەڵام یەك هەڵە لە (پەیوەندی سیاسی)دا دەتوانێت بۆ میللەت و وجودی حەرەکەتی مەکتەبی میللەت کارەسات هاوەربێت و هەرگیز نەتوانرێت کاریگەرییەکەی نەمێنرێت. موسوڵمان یەکسانە بە بەرپرسیارێتی.

---

* ) کاك ئەحمەد (رەحمەتی خوای لێبێت)، ئەم وتەی لە نامەیەکدا نووسیوە، کە بۆ (د. بەنی صەدر)ی سەرۆك کۆماری ئەو کاتەی ئێرانی ناردووە.

******

❁ ئینسانی موسڵمان بەمەرجێك لە سنوری بەرپرسیارێتیدا بێت ئەركی ئەوەیە لە هەرشوێنێكدا مەزڵومێك لەبەرامبەر زاڵمێكەوە ڕادەوەستێت هاوكاری مەزڵومەكە بكات دژی زاڵمەكە، بەمەرجێك شەرایتی تەكلیف تەحەقوق پەیدا بكات، تەنانەت موسڵمانێك زوڵم بكات لە مەملەكەتێكی نا موسوڵمان دەبێت هاوكاری نا موسوڵمانەكە بكرێت دژی موسوڵمانەكە و بدەیت لە تەوقی سەری، ئەگەر موسوڵمانبێت ئیشی واناكات(زوڵم ناكات).

******

❁ لە ناو موسوڵماناندا ئەم دەركە پەیدا بووە كە سیاسەت لە دین جیاوازە! كاتێك باسێكی سیاسەت دەكەن ئیتر كارێكیان بە (كتاب و سوننەت)ەوە نییە، هەروەك ئەوەی هەمیشە لە سەرانی حوكمەتەوە بیستوومانە، كە لە بیرمەندانی ئیسلامییەوە وەریانگرتووە و وەك (تووتی) دەیڵێنەوە: دین و سیاسەت یەكێكەو جیاكردنەوەیان لەیەكتری خیانەتەوە، بەڵام لەكردەوەدا دیارە كەتێنەگەیشتوون، لە قانوونی ئەساسیدا دیارە كە تێنەگەیشتوون، چونكە باشترین نمونەی جیاكردنەوەی دینە لە سیاسەت.

******

❁ كۆمەڵگەی ئیسلامی ئەوەیە، كە سەرچاوەی قورئان و سوننەت بێت ومەبنای بەڕێوەبردنی ڕەوشی ئیجتهادی شورا بێت.

******

❁ تەواوی كەشكەشانەكان هەمووی هێزی مادی بێت و ڕوویەرووی من ببنەوە چ گرنگییەكیان هەیە بۆمن؟ لەكاتێكدا بزانم خودا لەمن ڕازییە و منی خۆشدەوێت.

******

❁ كاری (مەكتەب قورئان) ڕێكخستنی حەرەكەتێكی ئیسلامیە بۆ تازە كردنەوەی ئیسلام, لە سەرەتاترین مەسائیلی ئیسلامیەوە (پەروەردە و فێركردن)دەست پێدەكات تەبلیغی ئیسلام دەكات تاوەكو بەرزترین (باڵاترین) مەسائیل, ئەمەش هاوشێوەی ئەو كاتەیە كە خودی حەزرەتی ڕەسول(ﷺ)ئەنجامی داوە, لە هەركاتێكدا و لە هەر گۆشەیەكی دنیادا كەسانێك لە موسڵمانان بیانەوێت ئیسلام زیندو بێتەوە دەبێت لەم

سەرمەشقە سود وەربگرن ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيراً﴾ {الأحزاب٢١}....دەبێت وەك ئەو ڕەفتار بكەن, هەڵبەتە بە ئیجتیهادی فراوان دەقیق لەو ڕووەوە تەواوی مەسائیلی ـ موو بە مووـ وەك ئەو بارو دۆخەی سەردەمی ئەو نییە. جێگەكان جیاوازن و لە هەندێك شوێندا ڕەنگی ئیسلام بەهێز و لە هەندێك شوێندا لاوازە دەبێت ئەمانە لەبەرچاو بگیرێن....بەلآم (شەمس) موتەعەهیدی یەك ئەركی ئیسلامییە, نەك حەرەكەتی ئیسلامی, وەك ئەو باوكەی منداڵێكی هەیە حەرەكەت دەكات بۆ ئەوەی منداڵەكەی (پەروەردەو فێر)بكات, بەلآم كاتێك نەخۆش دەكەوێت ئیتر ئەركێكی دیكەشی هەیە كە دەبێت چارەسەری بكات. (شەمس)مان بۆ تەعەهودی ئەو مەسئولیەتە عارزییە دامەزراندووە. ئەمە تەكلیفێكی. مەكتەب هەوڵدەدات یەكێك لە مەسائیلەكانی ئیسلامی لە عوهدە بگرێت, كە دەفعی شەڕە. (مەكتەب)حەرەكەتێكی ژێر بینای هەیە, (شمس)حەرەكەتێكی ڕووبینای ....

******

❋ لە سەردەمی شاه شاهیدا و لەسەردەمی دوای ئینقلابیشدا هەمیشە ئەم ئامۆژگاریە عەجیبەیان دەكردم! صەمیمانە ئاگاداری دەكەینەوە دەست هەڵگرێت و واز لەو كارانەی بهێنێت! ئاخر برای زانای دینی! یەك كەم بگەڕێرەوە بۆ قورئان و سەیریكە ئامۆژگاری خودا بۆ من ڕێك پێچەوانەی ئەوەی تۆیە!

خودا بۆ من دەفەرموێت: ئەگەر بە خاتری ڕێگەی خودا كوژرایت و یان بەو شێوەیە ژیات كە لە ڕێگەی خودادا ژیانت تەواو كرد, ئاگاداربە ڕەحمەت و مەغفیرەت لەلایەن خوایگەورەوە زۆر باشترە لەو هەموو كۆشك و تەلار و فەرش و ماڵەی كە ئەوان دەتدەنێ..

دەی من بیردەكەمەوە, كە وتەی خودا باشترە, تاوەكو تۆ. وتەكانی خودا قبوڵ دەكەم و وتەكانی تۆ ڕەد دەكەمەوە.

ئەی پیاوی زانایی دینی! ئەگەر من دەستم لە ئەركی دینی خۆم هەڵگرت لەبەر خاتری خۆم، تۆ دڵنیاییم دەدەیتێ یەك لەحزە دوای ئەوە بمێنم! ئەی بەدبەختی بێ چارە ئیتر

من چۆن دڵ خۆشکەم بە ژیان؟ ئەی کە ئەگەر دوای وازهێنان یەکسەر مردم چی بکەم لەم بەدبەختیە؟!

******

❁ ئەگەر کەسێك بیەوێت حەرەکەتێکی ئیسلامی بکات دەبێت لە ژیانی سیاسی پێغەمبەر (ﷺ) حاڵی ببێت, نەك تەنها ئیسلام بناسێت, باشە ئەوە ئیسلامیشت ناسی؟ بە شێوەی عیلم و مەکتەب و مەتڵەبێك, باشە گریمان ناسینەکەشت کامڵ بوو؟ دەی مەنهەج و رێگەو رەوشتێك مەترەحە بۆئەوەی ئەم مەکتەب و عیلم و فەلسەفەیە پێشکەش بکەیت و خەڵك رابکێشیت بۆ لای, مەکتەبەکە تایبەتمەندییەکی جیاوازە لەگەڵ مەکتەب و عیلم و فەلسەفەیەکی دیکە, ئەم تایبەتمەدییە رێگە و رەوشتێکی دیاریکراوی دەوێت بۆئەوەی کاریگەری بکات لە خەڵکی و شکڵ و شەخسیەت بداتە خەڵکی, جا ئەمەش جگە لە حاڵی بوون لە نەهجی حەرەکەتی سیاسی مەکتەبەکە ئیمکانی نییە دەستبکەوێت! بۆیە دەبێت تەماشای ژیانی سیاسی پێغەمبەر(ﷺ) بکرێت و, تەنها بە ژیانی ئەخلاقی و عەقیدەیی و کۆمەلآیەتی نابێت. ئەمانە هەر یەکەیان بۆ کاتی خۆی گەرەکتە, بەلآم بۆئەوەی گەرەکت بێت حەرەکەتێك مەکتەبی و ئینقیلابێك دروست بکەیت، دەبێت تەنها و تەنها سەیری ژیانی سیاسی بکەیت.

******

❁ هەر سیستەمێك (غەیری ئیلاهی) بێت تاغوتیە, و لە کۆمەڵگەدا تەبەقات دروستدەکات, ئیمکانی نییە بەبێ (ئیترافی و ئیستکبار) سیستەمێك وجودی هەبێت, جا ئیتر یا ئەوەیە هەر دووکیانی تێدایە یان تەنها (ئیترافە) یان (ئیستکبار), بەلآم خۆی شێوەی ئاساییی هەردووکیانە.

******

❁ ئاخ لەعنەتی خوا لە نەزمیّ، دینیّ،
نەزمی (طبقات) ڕجوا ئەووینیّ،
لەلایێ، خەڵکی ملکزو هەژار
لایێتر (اتراف) لەتەك (استکبار)
******

❁ براکانم! کوشتن زاتەن مەتڵوب نییە, کوشتن بە ناونیشانی هۆکار مەتڵوبە, کوشتەدان و شەهیددان بەناونیشانی پێشەکییەك بۆ ئەنجام گرتنێك مەتڵوبە! کە نەتیجەکەش عیبارەت بێت لە ئازادی و نەمانی زوڵم و زۆر! ئەگەر بەمەنتق بڕۆنە پێشەوە ئازادی نزیکتر دەبێتەوە, ئەگەر بێمەنتقیش بڕۆنە پێشەوە هەرچەند کوشتەی زۆرتر بدەن ئازادی دوورتر دەکەوێتەوە.
******

❁ براکانم! خۆپیشاندان: واتە قودرەت نمای, نەك واتە بەرد فڕێدان, نەك واتە زیادەڕۆی لە ڕووبەڕوو بوونەوەدا! خۆپیشاندان: واتە بە دوژمن و دونیایی پیشان بدەیت کە هەیەت و تەسلیم نابیت و شکست ناخۆیت, ئەگەر کوشتەی زۆر بدەیت شکست دەخۆیت ئەو کاتە ئەو خۆپیشاندانەت مەنفی دەبێت.
******

❁ لە کاتی خۆیشاندان و ڕووبەڕوو بونەوەدا، مەرجی گەورەی ئاگاهی ئەوەیە کە مرۆڤ هێزی باگنی(ناوەکی) زۆرتر بێت لەو هێزەی وا پیشانی دەدات, مرۆڤ نابێت هەرچی هێزی هەیە بیرێژێتە مەیدان, نابێت تەواوی هێزی خۆی لە ڕۆژێکدا لەدەست بدات!
******

❁ تەنها میللەتێك مافی ژیانی هەیە و لایەقە زیندەگی بکات و، وەك ئینسان ژیان بگوزەرێنێت، کە بەرپرسیارێتی و ئەرکی خۆی بناسێت و لە ئەرکی خۆی لانەدات.
******

❁ سادەترین وەزیفەیەك كە ئینسان هەیەتی، تەنانەت هەرچی گیاندارانە هەیانە، بریتیە لەوەی ئینسان لەسەر(حەق–ماف)ی خۆی بێتە جواب و دیفاع لە حەق بكات.

******

❁ مافی هەر تاكێك لە تاكەكانی میللەت، مافی منە، مافی هەر تاكێكی وەك من مافی تەواوی مەملەكەتە، كاتێك كۆمەڵێك لە خەڵكی خۆیان ناونا(میللەت) دەبێت وەك یەك ماڵ، وەك یەك خانەوادە مافە هاوبەشەكانی خۆیان بزانن، ئامادەبن هەروەكچۆن

ئینسان پارێزگاری دەكات لە خانەوادەی خۆی، لە مافی خانەوادەی خۆی، پارێزگاری بكات لەمافی تەواوی ئەو میللەتە.

******

❁ ئەو میللەتە مافی ژیانی هەیە، ئەگەر ئەوەندە وریا بوو، ئەوندە بەئیمان بوو، ئەوەندە هەستی بەبەر پرسیارێتی كرد، كەكاتێك مافیی خوراو نرایە ژێرپێ لەسەری بێتە جواب.

******

❁ لە كۆمەڵگەی ئیسلامیدا نەتەنها تاك ئازادە، بەڵكو هەرچی ئینسانە موكەلەفە هەرشتێك بەحەقی دەزانێت بیڵێت، ئەگەر كەسێك شتێك بەحەق دەزانێتو نەیڵێت گوناهی دەكات.

******

## سەرچاوەی وتەکان:

١. قورئانی پیرۆز

## کتێب و نووسراوەکان:


١. کاک ئەحمەدی موفتی زادە: دیاریێ بۆ یاران(دیوانی شیعری)، چاپی یەکەم، ئێران، زستانی ١٣٨٦.

٢. ئەحمەدی موفتی زادە: درباره کردستان،

٣. کاک احمد موفتی زادە: نامه ها، بخش اول، بدون مکان و سال چاپ.

٤. کاک احمد موفتی زادە: فیطرەت و هیدایەت: و.کامەران حەمەسەعید،

٥. ئەحمەدی موفتی زادە: چۆن و لە کوێوە دەست پێبکەین، و. کامەران حەمەسەعید، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠١١.

٦. کاک ئەحمەجی موفتی زادە: نامەیەك بۆ کاك فاروقی فەرساد، لە ئینتەرنێتەوە...

٧. سەروەت عبدالله: کاك ئەحمەدی موفتی زادە، دەروازەیەك بۆ خەباتێکی نەناسێنراو، بەرگە یەکەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی سیما، سلێمانی،٢٠١٠.

٨. سەروەت عەبدولا: کاك ئەحمەدی موفتی زادە(هەولێك بۆ ناساندنی هەندێك لە بۆچوونە پەروەردەی و فکری و سیاسییەکانی)، کتێبی دووەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی سیما، سلێمانی، ٢٠١١.

٩. سەروەت عەبدولا: بونیادی خێزان و پەروەردەکردنی تاك لە دیدی کاك ئەحمەدی موفتی زادەوە، چاپی یەکەم، سلێمانی، چاپخانەی سیما،٢٠١٢.

## سەرچاوە دەنگییەکان ( سیدە تۆمارکراو )؛


١. سخنرانی در شب معراج: کوردی: (١٣٨)، ١.

٢. درس دیـن و انســان (١٦٤)،کـوردی و فارســی: (١ – ٢ – ٣ – ٤ – ٥ – ٦ – ٧ – ٨ – ٩– ١٠ – ١١ – ١٢ – ١٣ – ١٤ – ١٥ –١٦ – ١٧ – ١٨).

٣. وتـــــاری گـــــۆنگرەی دووەیەمــــــی شـــــەمس: فارســــــی (١ـ٢ـ٣ـ٤ـ٥ـ٦ـ٧ـ٨ـ٩ـ١٠ـ١١ـ١٢ـ١٣ـ١٤).

٤. مناجات(٢): کوردی و فرسی، (١ـ٢).

٥. پەیامی کاك احمد بعد از مرخص شدن از زندان (٢٥٢): کوردی (١).

٦. پەیام (٢٥٣): کوردی (١).

٧. عوامل نابسامانیهای فکری و انزوای جوانان(٢٠٨): کوردی (١).

٨. هنر ذوق جمال دوستی و تفـاوت حـرف ذهـن بـا حـرف قلـب (ویـدئو ٣) (٢٤٩): کوردی(١ـ٢).

شهادت و ارزش مقام شهید(١٩٧)، کوردی (١ـ٢)



ئازادی مرۆڤ لە دەروونیدایە، مرۆڤێک لە دەروونەوە ئازاد بوو تەواوی هێزەکانی دونیا یەکبگرن ناتوانن ئەسیری بکەن، خۆئەگەر مرۆڤێکیش لە دەروونەوە ئەسیر بوو تەواوی هێزەکانی دونیا یەکبگرن ناتوانن ئازادی بکەن و ئازادی پێبدەن.

************

مرۆڤ لەسەردەمی جەنگەڵدا بەدەست حەیوانی دڕەندە و تۆفان و ڕەشەبا و سەرما و گەرماوە ڕەنج و عەزییەتی دەبینی، جا هەرچییش بوو قابیلی تەحەموول بوو، ڕزگاربوونیش لێیان ئاسان بوو، بەڵام لەم سەردەمی شارستانییەت و پێشکەوتنەدا مرۆڤ بەدەست مرۆڤەوە گیری خواردووە و ئازار دەچێژێت! بەدەست داگیرکەرانەوە ئەشکەنجە دەدرێت، ئێستا مرۆڤگەلی برسی (هەژار و نەدار و بێدەستەڵات )، کە دەڵێن "بەشمان مەخۆن"، بە تۆپ و ئاگر وەڵامیان دەدرێتەوە..!

چاپخانەی سیما

٢٠١٤